# کۆژانی حەیران

## بەرگی دووەم


نووسین و دانانی

عومەر حاجی عەلی شەناغەیی

پێداچوونەوە و پێشەکی

غەفوور مەخمووری

★ ناوی کتێب : کۆژانی حەیران - بەرگی دووەم .

★ نووسین و دانانی : عومەر حاجی عەلی شە ناغەیی .

★ پێداچوونەوەو پێشەکی : غەفوور مەخمووری .

★ تایپ و دیزاین و ناوەڕۆك :

★ هەڵە چن : خۆم و ئومێدی کورم.

★ دیزاینی بەرگ : ڕزگار سەلیم

★ نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم - ٢٠٢٣ بەرگی دووەم .

★ شوێنی چاپ : کوردستان – هەولێر .

★ لە سە ر ئەرکی ( خــــۆم ) چاپکراوە .

★ تیراژ: (٥٠٠) دانە .

★ لە بەڕێو ە بەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی

( 364 )٢٠٢٣ پێدراوە .

★ پێشکەشە بە :

( ڕۆحــی پـــاکــی بـــاوکـــی خـــۆشـــەویـــســـتـــم )

# پـــێـــشـــەکـــی

## نـــووســـیـــنـــی : غـــە فـــوور مەخـــمـــووری

لەو کاتەوەی مرۆڤ لە ئەشکەوت وچیا کانەوە هاتۆتە خوارەوە لە پێدەشتەکاندا نیشتەجێبووەو دواتر کۆمەڵ کۆمەڵ لە دەوری یەکدیدا کۆبوونەتەوەو لە سنوورێکی جوگرافی تایبەتدا ژیاون بوونەتە خاوەن داب و نەریتی تایبەت بە کۆمەڵگە سەرەتاییەکە و بە پێی رۆژگار داب و نەریتەکان گۆرانکارییان بەسەردا هاتووە، بێگومان کوردستان وەك یەکەم لانکەی مرۆڤایەتی و شارستانییەت و نیشتەجێبوونی مرۆڤی سەرەتایی خاوەن دیرۆکی تایبەت بە خۆیەتی لەم بوارەدا، شێوازی بیرکردنەوەو نەخش و نیگاری سەر دەفرو دیوارەکان و شیعرو ئاوازو گۆرانی ئەوێ دەمێ بەرهەمی هزری مرۆڤایەتی و ڕەسەنایەتی ئەو سەردەمە.

دوای پێشکەوتنی کۆمەڵگە لە خێزانەوە بۆ تیرەو هۆزو دواتر نەتەوە، پێشکەوتنی شارستانییەتی کۆن لە گوندەوە بۆ شارو دواتر دەوڵەت، وردە وردە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی پەرەی سەندو فراوان بوو، بە پێی قۆناغی پێشکەوتنی مێژوویی چەندین نەتەوە دروستبوون و بوونە خاوەن رەسەنایەتی و کلتوورو داب و نەریت و ئەدەب و هونەری خۆیان، نەتەوەی کوردیش وەك نەتەوەیەکی ڕەسەنی رۆژهەلاتی ناڤین خاوەن رەسەنایەتی و کلتووری تایبەت بە خۆیەتی.

بێگومان ڕەسەنایەتی هەر نەتەوەیەك لە دەوڵەمەندی فۆلکلۆرەکەیدایە، دەوڵەمەندی فۆلکلۆری کورد رەسەنایەتی نەتەوەی کورد لە رۆژهەلاتی ناڤیندا دەخاتەڕوو، ئەگەر سەیری تێکستە فۆلکلۆرییە کوردییەکان بکەین رۆڵی نەتەوەی کوردمان لە بیناکردنی شارستانییەتی دەڤەرەکە بۆ وەدەردەکەوێت، بەتایبەت لە چیرۆك و داستان و بەیت و لاوکە مێژووییەکاندا، هەروەها هونەری بیناسازی و دەفرسازی و گەلێك پاشماوەی کۆنی دیکە لە میزۆپۆتامیای رەسەنایەتی کورد لە دەڤەرەکەدا دەسەلمێنن و سەلمێنەری ئەو ڕاستییەن کە کورد رەسەنترین نەتەوەی رۆژهەلاتی ناڤینە و کورد بنیاتنەری بەشێکی زۆری شارستانیەتی ناوچەکەیە، لەگەڵ ئەوەشدا بەدرێژایی مێژوو زوڵم لە کوردان کراوەو هەوڵی لەناوبردنیان بەخاك و خەڵکەوە دراوە، ئەو رابردووەش

لە تێکستە فۆلکلۆرییەکاندا بەباشی ڕەنگیداوەتەوە، فۆلکلۆری کورد خودان تایبەتمەندی خۆیەتی و بۆتە تۆماری خۆشی و ناخۆشییەکانی کورد، چیرۆك و داستان و ئەفسانە و ستران و لاوك و حەیران و بەیت و مۆسیقا و سەمای کوردی خودان تایبەتمەندی و رەسانەیەتی خۆیانن، ئەوەی لای کورد هەیە لای نەتەوەکانی دیکە نیە، ئەمەش وایکردووە فۆلکلۆری کورد لە فۆلکلۆری نەتەوەکانی دیکەی دەڤەرەکە جیا بێت، هەر بۆ نمونە لاوك و حەیران کە دوو جۆرە مەقامی تایبەت بەنەتەوەی کوردن، نەتەوەکانی دیکەی دەڤەرەکە ئەو جۆرە مەقامەیان بەم شێوەیە نییە و، رەنگە شتی دیکەیان هەبێت، دەتوانین بەم شێوەیە لە لاوك وحەیران بڕوانین:

حەیران : تۆماری ئەڤین و دڵداری و سروشتی جوانی و جوغرافیای کوردستانە.

لاوك : تۆماری مێژوویی و داستانی ئەڤین و پاڵەوانێتی و سوارچاکی و بەرخودانی نەتەوەیی کوردە بەپێی قۆناخە مێژووییەکان.

ئەوەی لێردا مەبەستمانە زیاتر تیشك خستنە سەر بابەتی حەیرانە، زۆر جاری دیکە وتوومەو ئێستاش دەیڵێمەوە، کە حەیران ئەو ئاوازە بەسۆزەیە کەوا لە گەرووی شمشاڵی شوانەکانی کوردستان دێتە دەرەوەو بەرۆژگارێکی ترمان ئاشنا دەکات ئەویش رۆژگاری رابردووە، باسی ژیانی سادە و ساکاری کۆمەڵی کوردەواریمان بۆ دەکات و خۆشی و ناخۆشی میللەتمان بۆ دەردەخات، حەیران جۆرە مەقامێکی کوردییە و بە زۆری لەسەر شێوەی (بەیات) دەگوترێت، باسی جوانی و ناسکی ئافرەت و خۆشەویستی نێوان کچەتیمە حەیران و کوڕەتیمە حەیران و جوانی و رازاوەیی سروشتی کوردستان و راوو راوشکارو پیاوماقووڵانی کورد و ئایین و داشۆرین و هەندێ جار مێژوو و دەستووری کوردەواری و گەلێ لایەنی دیکەمان بۆ دەکات.

بە پێویستمان زانی پێش ئەوەی بێینە سەر کرۆکی مەبەست ئەو چەند دێرەی سەرەوە بنووسین بۆ ئەوەی خوێنەری ئازیز سەبارەت بە حەیران بەرچاوڕوونییەکی زیاتری هەبێت.

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە باسکردنی ناوەڕۆکی بەرگی دووەمی کتێبی

(کۆزانی حەیران)ە، کەوا لە نووسین و دانانی برای بەڕێزو خۆشەویست کاك ( عومەر حاجی عەلی شەناغەیی)یە ، برای بەڕێزم کاك عومەر شەناغەیی، دەستنووسی حەیرانەکانی (کۆزانی حەیران)ی بۆ هێنام کەوا پێیاندابچمەوەو پێشەکییەکیش بۆ کتێبەکەی بنووسم، زۆر خۆشحاڵ بووم کەوا بەڕێزیان خوی داوەتە حەیران نووسین و، بە شێوەیەکی سەردەمییانەو بە رەچاوکردنی تایبەتمەندی رەسەنایەتی حەیران حەیرانەکانی نووسیوەو داڕشتووە.

لەبەشی یەکەمی ئەو کتێبەدا کاك عەمەر شەناغەیی کۆمەڵێ بۆچوونی خۆی سەبارەت بە حەیران لەڕووی ماناو دارشتن و وتنەوە خستۆتەڕوو کە مایەی رامان و گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەن، ئەو بۆچوونانە دونیابینی ئەون بۆ حەیران.

بەشی دووەمی کتێبەکە بریتییە لە تێکستی ئەو حەیرانانەی کەوا خۆی نووسیونی، ئەگەر بەوردی لە تێکستی حەیرانەکان وردبینەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا بەزمانێکی تەڕو پاراوو سادەو ساکاری کۆمەڵی کوردەواریمان حەیرانەکانی نووسیوە و ئەو وشانەی کە بەکاریهێناون وشەی رۆژانەی سەر زاری خەڵکن و بەئاسانی لێیان تێدەگەین و دەزانین مەبەستی حەیراننووس چییە، کاك عومەر حەیراننووسێکی لێهاتوو و بەسەلیقەو دڵتەڕە.

ئەگەر سەیر بکەین دەبینین کاك عومەر شەناغەیی هێندە بەجوانی و رێکوپێکی حەیرانەکانی داڕشتووە و سەروایەکی تەواوی بۆ داناوە، کە دەکاتە (سەربەندو ناوبەندو دوابەند)، واهەست دەکەین شیعرێکی میللییە، بەڵام لەڕاستیدا حەیرانەکان شیعر نین بەڵکو پەخشانە شیعرن، تەواوی حەیرانەکانی بە شێوەزاری دەشتی هەولێر نووسیوە، بێگومان حەیرانیش بەپێی شوێن و ناوچە و شێوەزمانەکەی دەگۆڕێت بۆ نموونە حەیرانی دەشتی قەراج جیاوازە لەحەیرانی دەشتی رانیەو قەڵادزە، نووسەر لە شێوەزاری هەولێر زۆر شارەزایە بۆیە ئەگەر سەیر بکەین دەبینین زۆر لێهاتووانە وشەکانی لە شوێنی خۆیاندا بەکارهێناون.

حەیرانەکانی کاك عومەر شەناغەیی ، سۆزی پەنگ خواردووی ناوەوەی کوڕەتیمە حەیرانە و دەکولێ و هەڵدەچێ، تۆماری ئەڤینە و باس لە بەمراد نەگەیشتن و بێوەفایی ماڵە بابی نازدار حەیرانێ لە بەرامبەر خۆشەویستی و وەفاداری کچەتیمە حەیران و کوڕەتیمە حەیرانێ دەکات، هەناسەیەکە بۆن کروزی دووری و سۆزداری و توانەوەو هەڵقرچان و فەنا بوونی لێدێ! هەندێ جاریش خۆشیو ناخۆشی نەتەوەو کارەسات و رووداوو نەهامەتییەکان لەئامێز دەگرێ.

کاك عومەر شەناغەیی،هەوڵیداوە کارەسات و مەرگەساتەکانی نەتەوەکەمان بێنێتە نێو رووبەری حەیرانەکانی و لێهاتووانە ئەو بابەتانەی گواستۆتەوە نێو تێکستەکان، کە ئەوەش دەچێتەی خانەی ئەدەبی بەرگری،حەیرانەکان ڕەنگدانەوەی واقیعی کوردستانن بە خۆشی و ناخۆشییەکانەوە.

لێرەوە دەستخۆشی لە کاك عومەرمام حاجی عە لی شەناغەیی دەکەم و پڕبەدڵ پیرۆزبایی لێدەکەم و هیوای بەردەوامی و سەرکەوتنی بۆ دەخوازم.

( لەگەل ڕێزدا )

## کورتەیەك لە ژیانم

★ لە بەرواری ١٩٦٢/٧/١ لە گوندی (شەناغە)ی کەندیناوە سەربە شارۆچکەی دیبەگە چاوم بە دونیای ڕوون هەڵهێناوە.

★ قوتابخانەی سەرەتاییم هەر لە شەناغە تەواوکردووە .

★ ساڵی ١٩٧٤ هاتوومەتە شاری هەولێر قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی و پەیمانگام هەر لەو شارە خۆشەویستە بە پلەی دبلۆمی هونەری کارەبایی تەواوکردووە .

★ هەر لە منداڵیمەوە لەگەڵ باوکی خۆشەویستم گەڕاوم لە خۆی دانەبڕیوم لە کۆڕو مەجریس و مزگەوت و مەولود خوێندنەوەو پرسەکان و شایی و گۆوەند و سەفەرەکانی ،لەگەڵ پەروەردە شیرحەلال و بێگەردەکەی دایکم و فرچکگرتنم بە گەورە و گچکەیی و خزمەتکردنی گەڵ و نیشتیمان ڕێزو حورمەت بۆ من بوونەتە قوتابخانەی خێزانی.

★ هەر لە منداڵیمەوە دەنگی خۆش و دەقی بەپێز سەرنجی منیان ڕاکێشاوە گوێم لە بەرنامەکانی شوکروڵلای بابان و وەرزش لە هەفتەیەکی (موئەیەد بەدری) پێدا هەرگۆی یاری تۆپی پێی عێراقی و مامۆستای خوالێ خۆش بوو (مەلا عومەر دیبەگەیی)ومانشێتی کردنەوەی ڕادیوی دەنگی کوردستانی عێراق ڕادەگرت، هەتا ئێرەم هێنایە، ڕازیمە بەو بەشەی خوای گەورە پێی کەرەم کردووم، ئەوەندەی لە توانامدا بووبێت لایەنی ئایینیشم فەرامۆش نەکردوە بەندە و تاقەتی خۆم ئێستاش ڕاستە تەمەنم (٦٠) ساڵە بەڵام بڕوا بکەن دڵم هەر ئەو دڵەی جارانە وەکو دەڵێن ئەگەر پێت بکرێ دونیا چۆنی بگری هەروا دەڕوا هەوارزو نشێوی زۆرو نەبوونیشم دیتووە، خەم و پەژارەشم هەبووە بەخەمانیش چ پێکنەهاتیە، بەڵام چاومان لە دەستی کەس نەبووەو خودا موحتاجی نامەردیشی نەکردینە.

★ هیوام سەربەخۆبوونی کوردستان وپیشوەچونی بزاڤی هونەرو ئەدەبی گەلەکەمە بەگشتی و بەتایبەتی گرنگیدان بە بەرهەمی کلتوری و فۆلکلۆری و میللی ڕەسەن.

حەزدەکەم سەرنجتان بۆ ئەو چەند دێڕەی خوارەوە ڕابکێشم ئەویش دەڵێم:

دوو گرێ لە دڵمە یەکیان : هەرچی بەدکارو ناحەزی بەینی دوو دڵانە خێرو خۆشی لە خۆی نەبینی، ئەوەی ئاستەنگ لە پێش کەس و کارو دەوروبەری لادەبا ئاسانکاری دەکا و لێبووردەیە خوا پایەداری بکا.

دووەمیان : ئاڵای کوردستان ببینم وەکو دەوڵەت و کیانی سەربەخۆ لە نەتەوە یەکگرتووەکان بشەکێتەوە بێشك کۆتایی هەموو گیانلەبەرێك دابڕان و جودابیە لە دونیای فانی، کەسیش فریشتە ئاسا نیە گوناهەکانیشمان لە ئاست بەزەیی و لێبوردەیی خودای مەزن و دلۆڤان دلۆپێکە لە دەریایەك.

(( سوپاس ))

## حەیران چیـە؟

★ زۆر لە ئەدیـب و نوسـەران و شـارەزایانی بـواری زمـان ڕایـان وایە وشـەی حەیـران وشـەیەکی عەرەبـی بێـت و لە حیـرە هـاتبێ، واتە دۆشـدامان، بە واتـایەکی دیـکە لە هەمـبەر ڕوداو و، دیمەنێکـی نـاوازە، یـان بـاوەڕ نەکـراو بەکارهـاتبێ یـان سـەرگەردان بـوون بـێ، یـان سەرسـوڕمان و بە قوربـان بوون و سۆزوعەشق و ئەڤینێکی بێسنوور ... هتد .

هەندێکیش دەڵێن لە هەییارانەوە وەرگیراوە یان هەریاران وەك پرۆفیسۆر د. عوبەیدوڵلای ئەیوبیان کە لە ساڵی ١٩٢٨ لە مهاباد لە دایکبووە پتر لە سەت کتێبی لە چاپداوە لە (ئاسۆی فۆلکلۆر) ژ ٢٣ ، ل٦٩دا باسی کردووە.

★ وشەی حەیران لەناو دەقی حەیراندا لۆ هەردوو ڕەگـەز بەکاردێ واتە کیژو کوڕ یان نێرو مێ، وشەی حەیران پارێزەری نهێنی ناسنامەی هەردوو خۆشەویستـە، واتە ناو ناتۆرەی ناوزڕاندنی تێدا نیە واتە کوڕەکە دەرێ کچەتیمە حەیران یان کیژێ حەیران یان حەیرانەکەی من، کیژەش دەرێ کوڕەتیمە حەیران یان کوڕەتیمەلاوە .

★ حەیران زیاتر بە سەر کیژو دۆست و گراوو یارو دەستگیراندا هەر گۆترایە هەرچی لاوکە زیاتر بە سەر لاوو سوارچاك و عەگید و شەڕ و لێقەومان و تاڵان هێنان و لێستاندنەوە و سوارچاك و کەمتر بە ئەڤینی و سۆزداریدا گۆتراوە، ئینجا چ پیر بیڵێ چ لاو پێی دەگوترێ لاوك یان لاوژە لە باکور و لاوکە لە ڕۆژهەڵات هەردووکیان هەر لە وشەی (لاوەکە)وە وەرگیراینە.

★ دەق و گۆتنی حەیرانی ڕەسەن لای مـن وەکو کوڕو کیژێکی تەمەن چواردە ساڵیە بە عەشق وسـۆزو ئەڤنێکی ڕۆمانسیانە سەردەمی دڵداری دەبەنەسەرو نازانن پیربوون چیـە ئەگەر بەدکارو ناحەز لێیان بگەڕێن و ئیرەییان پێ نەبەن.

★ لەناو هەموو بابەتێکی نووسین هەر لەشیعر هەتا دەگاتە چیرۆك و ئەفسانەو بگرە لاوکیش تاکە دەق کە گۆترابێ و نووسرابێ دەقی هونەری حەیرانە کە تایبەتمەندییەکی جوودای تێدایە ئەویش بەکارهێنانی وشەی هەجووی مانایەکەی بە پێچەوانە بێ یان مانای خۆشەویستی و پەرۆشی ببەخشن بۆ نموونە: کچەتیمە حەیران ـ کوڕەتیمە لاوە ـ سوکە ژنەکانی دەست بەبازن ـ بابانکۆر ـ سەر بەتارو هەشێ ـ مارمیرات .....هتد.

★ حەیرانی ڕەسەن واتە (دەنگ و دەق و ئەداکردن) مافی حەیرانەکە بدا لەوێدا وەکو ئەو ئەستوکە هەنگوینە وایە کە بە شیلە و کاکڵی گوڵ دروستبووبێ هەرگیز تێکناچی، یان وەکو ئەو شەرابە وایە هەرچەند بمێنێ و کۆن بێت باشتر سەرخۆشت دەکاو خەمەکانت دەڕەوێنێتـــەوە.

★ دەتـــوانم نـــاو لە حەیـــران بنـــێم ژانـــری دڵ یـــان دەردە دڵ، واتە حەیـــران دەربڕینـــی کۆژانەکـــانی نـــاخی کۆمەڵگـــای کـــوردە و پاشـخانێکی پـاك وجـوانی ژیـانی سـەردەمی خـۆیەتی، بگـرە لەسـاڵانی پـــێش هەشـــتایەکان ژیـــانی گونـــدەکان و شـــارۆچکەکانیش بەجۆرێـــك بـــووە وەکـــو لەدەقـــی حەیرانـــی حەیرانبێـــژە ڕەســـەنەکانی ئەو ســـەردەمیدا ڕا دیـــارە وا ئێـــستا بـــۆ هەڵێنجـــانی وشـــەی ڕەســـەن و هەڵقـــولاو لە دڵ و دەروونێکـــی بـــێ خەوش و گەرد بـــۆ ئێمەمانـــان بووینە سەرچاوە و فەرهەنگ و قوتابخانە.

گومانی تێدا نییە لەو سەردەمیدا بارو گوزەرانی ژیان و کارو کاسبی زۆرگران بووە نموونەی یەك لەکارەکان باس دەکەم لەسەرەتا تادەگاتەوە ناو عەمبار، ئەویش گەنم و جۆ چاندنە: دیاریکردنی زەوییەکە پاش باران پەریی پایزان ئەوجا لات ڕاکێشان و خرتە و تۆو جۆتکردن بە هەوجار و بژاری زیوان وپاسکردنی تەبارە و ئامادەکردنی داس و هەسان و قەیناغ و کەپرو ئاوی جەرە و جەلعەو کوندە و درونە و مەرۆ و تێلەکێش و گیشەکەر و شەغرە وجۆخین وقرشە و گێرە و جەنجەرو هوردە و چاوە و پەرەناوە و شەنەبا و ڕە وسەوشەقرو برکردن و زەکات دەرهێنان و کاو کادین و شەلتەکا کێشانەوە و داکردن و داگرتنی جەوار و فەردەی داخشین و داخسۆری جاران بە گەنم وجۆ و کردنە ناو عەمبار و چاڵ و لەودە ، هەروەها قوڕی پرکا گرتنەوە ئەوجا خوسان و سواقدان ...هتد .

ئەوە یەك برگە بوو لە ئیشوکارەکانی ئەوێ دەمێ، ئەگەر بێمە سەر مەڕ مەڕداری و شوانکارەیی و ژیانی کۆچەری و شینایی و سەیناغ و بیستان ڕنین و کێشانەوە و کۆل و بیر و شیرناوو کۆرو قەسار وکانیاو وهەرەوەزی گۆرانی کارو دار و لێمشت و ئاومارك خڕکردنەوە ... هتد

ئەوە بە دەیان لاپەڕە تەواو نابی، مەبەستم لەو باسە ئەوەیە ئایا دیداری خۆشەویستان بەچ دەردەسەرییەك بووە ئەوەندە ماندی بووینە خوا خوایان بووە بگەنە سەرجێیێ بۆیە حەیرانبێژان خەم وخۆشی و جێژوانی دڵ و دڵدارە چاو لەمەستەخەوەکەیان بەحەیران لە قەدپاری چیا و گردو بان و بناران بە دەنگی بڵندی هەوایی چیایی و لە کۆڕ و مەجریس بەزمان پاریێزی گەورە و گچکەیی و ئەدەبەوە بە حەیرانی ئایینی و غەریبی و سۆزداری بەدەنگی نزم و مەجریسی چڕیوەو پەنای بردیتە بەر پلکەپێناوێ بۆ هێنان و بردنی قسە و دیاری کل و کلدان و بۆن و بەرام و ئاوێنە و دەستەسڕ و شانە ... هتد. بۆیە گۆتیتیان بریا باجگرو باجەستینێ ماچان بام یان دەست باوێمە سەرشان و ملیێ

بەکەزی ئەوجا لۆخۆم دەرینم شەمامەی باغەرێ و، دەمەڕۆ با دەمەکێ بتگەمێ حەیرانێ بەدرێ خۆم، زۆربەیان بەو حەسرەت و داخەوە چوونەوە بن خاکێ گری و گۆڕوگۆڕخانان، وەکو زۆربەی داستانەکانی ئەویندارى خەون و ئاواتەکانیان نەهاتەدی.

★ حەیران وێنەی جوانی کیژێکی و شۆخ و شەنگ و ناسکی کوردەوارییە لەگەڵ شوان وسەپان و تێلەکێشان مەرۆی هەردەگرتەوە یان لەناو کۆزو هاوێرێ کار و بەرخان و مێشکەمژانێ یان بەلەنجە و لار دێتەوە لەسەر کانی و دەراو و گۆمێ شیرناوێ کوندە لەپشتێ یان گۆزە لەسەر شانی یان لەبەر هەیوانێ تەونکارە نەخشی هەردەگری لە مافور و سەرەناز و تێڕ و توری، یانیش بەدەستە ڕەنگینەکانی کراو دەنەخشێنی جەلە و گورینگی جەمەدانی دەچنی و لەسەر بەردەجۆنی گەنمی دەکوتی و بەردەدەستاڕی بادەدا یان بەکوتکەکی دارمەرحەم و سماق دەکوتی کۆز و کۆتانێ قەرەتاوری، یان ڕاوەستایە لەپەنا پانکەیێ ڕەشمارێ بەشلکەی ڕانی تەشی دەڕێسی یاخۆ لەبەر هەرمی ئاگری ساوارکورانێ ڕوومەتەکانی هەندەی دیکە سۆربووینەوە یان لەبەری بیرێ دەولکی وەردەگری بەو دەنگە بەسۆزەوەی دەرێ یاڵلا دڵی مەعشوقەکەی جۆشدەدا و هەستی حەیرانبێژ ولاو و گەنجان دەبزوێنێ بە بەژنی باریك و درێژو گچکۆکە و گەردەنێ زەردی بەخاری و پەرچەمێ شێتاری و کلکەی برۆیێ و ناوقەد بەکێل و کەمبەرە و گێ بەگوارە و پێ بەخرخار و مل بەهەوری و هیزارێ لە کێلێ کیستانێ دێتەوە لە دەراوو کانیان پەرچەمی شێتاری و ڕوومەتەکانی تەڕدەبی و زولف وپەرچەمی تێکدەئارێ لەگەڕ با و بۆرانێ، یانە کارمامزەکانی بناری قەرەچووغ و زوورگەزراویە لەبەر خاتری کوڕەتیم حەیرانێ ئاوێ خۆی دەخواتەوە لە کۆل و بیرو هەرکەوان، یان بە لەنجە ولار خۆی بادەدا وەکی کۆترۆکەکانی سەر لیسی و کەوەکانی سەر ڕەوەزە شاخان، چاوی وەك شەهێن و بازە برۆی سەقەرە گەردەنی قورینگ و گۆزەرەبڕادەکێشی سەرێ شێوەرومەحەلەگان، یان وەکی

بەردیلەکانی بەدامەن و بەرۆکە بەخۆ هەرشەقانی ئەفسوناوی جۆش وخرۆش دەبەخشی و نازی لێدەباری، هەنگینێ منێکی سوتاوی دووری حەسرەتی دابڕان و کوژراوی دووچاوی ڕەش و قۆرتێ گەردەنی زەرد و بەخاری و شەمامەی باغەرێی کیژۆرە جوانێ سەرگەردان و ماڵوێران دەکا لە ناو جوانی وخەم و تاری بە یەکنەگەیشتنی دڵ و دڵداری هەر ئاخان هەرینم بە خۆشی جێژوان و ناسۆری دەستلێکبەردانی خۆشەویستەکەی نیوشەوێ و ئاهوو نوزەی بەیەکنەگەیشتنی خۆشەویستی دڵخواز و لابەری خەمەکانم، ژانی دڵی خۆم بە حەیران خزاندۆتە ناو فەرهەنگی فۆلکلۆر و کلتوری ڕەسەنایەتی هونەری حەیران حەقی خۆمە برێم و بنووسم دەك پێناوی بە بەقاو متمانە و ڕاستگۆ خودات لێ ڕازی بی هەی بەدکاری بەدخوو بەدعەمەل خودا بە عەمەلی خۆت لەگەر بکا وەکی بوویەوە باعیزی دوو دڵان، هەی لەخۆت سەر بەهەش و تارێ یان لەخۆت وجاغ کۆرێ وەکی خارە ڕەسوول گەردی دەرێ ئاگرەکت بەربیتە مارێ بەتەنەکی نەفتی حەلەبێ کلیلەی بزرکردبی بەخۆی لەلای زۆری بی قەت نەحەسێەوە چونکە بوویەوە باعیزێ دوو دڕان ڕەنج بەخەسارمت کردین، لەگەر ئەوهەموو چەرمەسەری و بێمورادیەش حەیران هەر خۆڕاگرە و نهێنی پارێزی دۆست و گراوو خۆشەویست مەعشوق و دۆست و دەستگیرانەکەیەتی.

★ حەیران دەربڕینی ژانێکی پەنگخواردووی حەژمەت و ژان و ژووری دووری و دابڕان و ناخێکی پڕ لە ناسۆری خەم وخۆزگە و ئاوات و بریای بەیەکگەیشتن و باجگرو باجەستینی ماچان وجێژاوگە و ژوان و ئاهوو نووزەی ئاستەنگ و لێکدابڕاندن وئەهریمەنکردنە لەبەینی دوو خۆشەویست یان یەکترویستانە.

★ حەیران پێهەڵدانە بە مەککەو مەدینەی پیرۆز و یارو یاوەرانی پێغەمبەر (د.خ) و سەید و چاك وپیر و شێخ و مشایەخ و تەکیە و خانەقا و خەلیفە و دەروێش و مورید و ئاین و ئاینزاکانی کوردستانە، وەکو هەموو نوسەرو ڕۆشنبیر و زانایە بەناوبانگەکان لەسە ئەو ڕایەن کە مزگەوت و تەکیە و حوجرەکان فێرگە و قوتابخانەو ڕێتیشاندەربوونە لەسەردەستی مەلای پڕعیلم و نەرم و نیان و شاعیرانی تەسەوف و نیشتیمانپەروەر، ئێستاش هەر زێتەتە بەرهەمەکانیان بخوێتیەوە.

★ حەیران دیاریکردنی مێــژوو و جوغرافیا و شوێتەوارو هەستی نەتەوایەتی و شۆڕشگێڕی وپیرۆزی خاك و گەل و نیشتمانە، گڕی دەروونی حەیرانبێژی ڕەسەن و عەگیدە پەنگدەخواتەوەو وەك ئاگری تەندوور جۆش وخرۆش دەستینی و دیتەدەرێ، پەخشانە شیعرێکی کورت و پوخت و مانابەخش دروستدەکات و لە دڵەکان دەچەسپێ و ناخیان دەبزوێنێ و دەست لەبناگوێی دەنێ و بە دەنگێکی بەسۆز لە قوڕگێکی پاراو دەردەچێ و دەچردڕێ ناخی مرۆڤی سۆزدار و بریندار دەهەژێنێ و برینێ کەونە یاران دەکولێنیتەوە و موچڕکیان پێدادێنێ بە تایبەتی ئەوانەی دوای ساڵانێك پێکەوەبوونە و لە جێژاوگەی ژوان و سوگەو پەناو پەسیوان بە ترس و دڵەکوتێ گرێی دڵی خۆیان کردیتەوە کا بزانن کیهانیان کولترن و بەوان برینان کەتینە ناو خەم و تاریان و لەکۆتاییدا زۆربەیان ڕەنج بەخەساربووینە داخەکەی گرانم بەمراز و مەخسوودی خۆیان نەگەیشتن و سەرێ خـۆیان نایتەوە بن خاکێ گری.

★ حەیران ئەودەنگە زوڵاڵەیە لە قەد ڕەوەزە شاخ و سەر گردێکی بڵند و دۆڵ و نەورو بنار و قەدپار و هەرەت و ئاقار و دەشتی کاکی بەکاکی و سەر ئەوان کانیاو و هەرکەوانی کوردستانی ڕەنگین وجواندا لەناو گیا و کوریکە مێلاقە و مینازو کنێرو حاجیلە و کوریکێ کەس نەناسی لەسەر کانیاوان دەنگ هەڵدەبڕی و بەیارەکەی خۆیدا هەردەرێ، ئەوکاتە بێ شەراب سەرخۆش و مەستە وادەزانی دونیا هەر ئەوو یارەکەی تێدایە و شامی شەریفە، هەر لەبەرئەوەشە کە دەرێن حەیران و ساوار پیرنابن.

★ حەیران کارمامزو کێروشکی چاو لەمەستەخەو و فەرەقەتێی ناو شۆو وەزدان و سوسکەی قەد ڕەوەزە شاخ و سۆنەی دەوئاوو پۆڕی ناو کفرو گەزان و قاز و قورینگ و مراوی دەوگۆمان و بازێکی بەرزەفڕی بناری زوورگەزراوو گەرێی سەنگەرانی قەرەچوزغ و قەراج و کەندێتاوەو هەموو پێدەشتەکانی هەولێر و خۆشناوەتی و بیتوێن و مەرگەو پشدەر و باڵەکایەتیە هەتا دەگاتە دەشتی موکریان، هەموو و چیایە سەرکەش و جوانەکانی ئەو کوردستانە خۆشەویستەی خاکی کوردانە.

★ حەیران دەربڕی دەردی غەریبی و تەنیایی و کۆستی ناوادەی ئازیزانە، سارێژکاری کول و دەردو ژان و دامرکانەوەی گڕی سۆزو عەشقی دڵ و دڵدارو دەروونە پڕلە ناسۆر و زگسووتاوانە بۆیە ئافرەتیش بە کڕوزانەوەو سەردوولکە لەپرسەکاندا بۆ کۆستی ناوادەی ئازیزان ناخی خۆی ئاسودە دەکا، وەکو دەرێن بەردی دەتاوێتەوە، بۆ نموونە :

حەیران

حەیران نەمینێم سەت جاران دەبا لۆت نەمینێم*

خۆ مردم هەندەی بە بەژن و باراتدا هەربرێم و لە ڕێ و بانان ڕامینێم*

بریا مەرگی من بە پێش مەرگی توو بکەتبایە نەوەك لەپاشی توو لۆ کەسەر وخەم و تاریان بمینێــم*

★ ئەوانەی بەتەواوی لەحەیران دەگەن ودەزانن حەیران چیە و لە چ سەروچاوەی گرتووە دەزانن هەتا ژیان مابێ حەیران هەر دەمینێ، چونکە هەر لەم کات و ساتەی باوکە ئادەم و دایکە حەوا خلیسکیان بردو فریویان خوارد لە بەهەشت جێیان نەماو کەوتنە سەر دونیاو نەوەیان نایەوە هەتا ئێساتای تێیدا دەژین تاڵی و سووری و دەردەسەری عەشق و ئەوین و ئاستەنگەکانی ژیان هەر بەردەوامە .

حەیرانی ڕەسەن واتە دەق و ودەنگ و گۆتنەکەی پڕ بەپیستی خۆی بیت و ناخ بهەژێتی زەمانی کوڕینی و کیژینیت بینتەوە بیرێ و ئاخوداخ لۆ ئەوێ زەمانی هەڵبکێشی*

هەتا ژیان لەسەر خاکی کوردستان بمینێ و کورد هەبن حەیران و هونەر و زانستی فۆلکلۆر و حەیران هەر دەمینێ و، حەیران هەر حەیرانە و بەردەوام دەبێت و تایبەتمەندی خۆی هەیە لەناو کۆمەڵگەی کوردەواری.
ئەمنیش دەرێم: حەیران حەیرانە * حەیران کۆتانـــە *
خۆشەویستیێ دوو دران گەلە خۆشـە ئاخ و بێفایدە دەستلێکبەردان دەردەکی گەلەك گرانـــە*

یان دەڕێم:

دەچمەوە سەر چیایەکەی شێخەناسی زەینێ خۆم دەداوە کانییەکەی دەوبەستێ
چەندە جوانە لەبەر بنـــاری*

مارەبایی حەیرانێ کۆچ و کۆچباریان لێنا هاوارتە لەخۆم دەچنەوە لۆ بنەگەو بێرو
هـــەواری*

کیژ دەیگۆ کورە لاوێ ڕەشتارەی بەدرێ خۆم دەرێن ئەتووش دەچییەوە ئیجباری
و عەسکەری دەلۆم بەجێبێلە دەستڕی بۆندار شەرتبی ئەمنیش دەتدەمێ
خەناوکەی بەمۆری و مەرجان و قەنەفری لەملان سەدجار بەدیـاری*

یان دەڕێم:

ئەستێرەکم لێهەرات لەلای قیبلەتێ*

شەوق و شەبەقێ خۆی دەداوە دەوزێ و دەوزیان ڕۆنی دەکردەوە کاولە حەمرین و
دەوشـــەتـــێ*

کوڕ دەرێ: کیژێ حەیران دەرێن شەڕە لە دەشتی قەراج و کەندێناوەو شەمامکێ کیژ
دەیگۆ: دەهەستە لەخۆت ببەستە ڕەخت وخەریتان بگرە سەرێ مەیدانێ لەخەمێ
مندا مەبە سەد جاران لەمنت کـــەویتن لەگەر غیرەتـــێ*

## چۆنیەتی حەیران نووسین

**١/خاڵە هەرە گرنگەکانی نووسینی حەیران:**

★ دەقی حەیران هونەرێکی شێوەزار سۆرانییە لەوێشدا بەتایبەت تر شێوەزاری دەشتی هەولێرە، چونکە ئەگەر وشەی (در) کرایە (دڵ) و (لۆ) کرایە (بۆ) و(سامار) کرایە (سامان) و (مار) کرایە (ماڵ) یان (خین ) کرایە (خوێن) و (کەتە) کرایە (کەوتە) ... هتد، ئەوا حەیرانەکە لەگۆتندا تام و چێژی خۆی نابەخشێ یان هەر لە دەستی دەدا.

★ دەبێ شارەزاییەکی باش و دروستت هەبێ لە وشە و زاراوەی ڕەسەنی زمانی زگماکی دایك و کەلتوری کوردەواریمان بەتایبەتی لە جوغرافیای دەشت و دەرو کار و کاسبی جوتیاری وشوانکارەیی و هەرەوەزی و کارەکاندا .

★ دەبێت لەناخەوە حەزت لە حەیران بێ زۆر گوێ لە دەنگ و وشەی حەیرانبێژە ڕەسەنەکانی پێشان بگری.

★ پێویستە حەیران لەسێ بەند واتایەکی جوان و کاریگەر ببەخشی ، ئەگەر لەسێ بەندیش تێپەڕ بوو هەروەهایە زۆر جار دەگاتە چوار یان پێنج یان شەش هەتاحەفت بەندیش گۆترایە بەڵام بەندی کورت بن، وەستایی باشی دەوێ هەم دانانی یان نووسینی هەم گۆتنەکەش پشییەکی درێژی دەوێ.

★ حەیرانی پوخت و ڕەسەن سێ بەندە، مانایەکەی ناخ دەهەژێنێ، تامەزرۆی گوێگر دەشکێنێ ، موچڕك یان تەزی بەدڵەکان دادەهێنێ، چونکە ڕوخسارو ناوەڕۆکەکەی تایبەتە، زۆرجار حەیرانی مەجریسی و غەریبی فرمێسك لەچاوەکان قەتیس دەکاو هەندێ جاریش لە سەر ڕوومەتەکانی سۆری گورگوری ڕێژە دەبەستــن.

★ زۆرگرنگە وشەکانی کۆتایی هەرسێ بەندەکە یان هەموو بەندەکان سەرواداربن و بەپیتی بزوێن کۆتاییان بێت باشترە، بە نەبزوێتیش دەبی بەڵام لۆ دوابەند پیتی بزوێن باشترەو جوانتریشە بەسێ بڕگەی دەنگیش بنووسرێ و بگوترێ لە سەربەند و دوابەند وەکو(ناگری، گورگوری، موشتەری، مەرۆیێ) و (جوانێ، هیرانێ، ژوانێ) ، نەبزوێتیش (مەلەکان، بەلەکان، کەلەکان) و (نەمینێم، رامینێم، (هەمینێم) و، بەسێ بڕگەی دەنگیش بگوترێ بەتایبەتی لە دوابەند، چونکە حەیرانبێژی بەتواناو لێزان زیاتر لە دوابەند بە دیاردەکەوێ.هەروەها پێویستە شارەزابی لە خشڵ و جلوبەرگ و گوڵ و گیا و ناوی هەرەت و دۆڵ و نەورو شاخ و زوور و گرد وپاڵ...هتد هەریەکەیان لەجێی خۆی بەکاربینی.

★ نوسەری حەیران یان ڕۆماننووس یان شاعیر دەتوانم بڵێم کۆی ڕۆشنبیر و هونەرمەندان لە هەموو بوارەکانی هونەردا هەست ناسکترن، بۆیە ئەو سروشت و جوانیەی یان دیمەنی تراژیدیایەی ئەوان دەیبینن زیاتر هەستیان دەبزوێ وێنای دەکەن، بێجگە لەوێنەی خەیاڵ و ئەندێشە ئەویش هێنانەپێش چاوی هەموو جۆرە وێنەکانە ئەوجا وێنەکـــە جـولاو یان کپ یان دەنگی بێت ... هتد، ئەسپی خۆیانی لێ تاودەدەن، گومانم نیە هەر کۆپلە حەیرانێك وێنایەکە بە هەرسێ بەندەکەی حەیران، ئەوەی من لێرەدا مەبەستمە لە هزرو بیری گوێگری حەیرانی ڕەسەن تابلۆیەك دروست دەبێت، واتا و مانایەکی خۆی دەبەخشێ ئەگەر وابوو ئەوە پێی دەگوترێ حەیرانی تەواو یان ڕەسەن.
واتە دەمەوێ بڵێم حەیران هەر ئەوە نیە سێ بەندە حەیران بنووسی و سەرواشی هەبێ، ئەگەر ڕەچاوی مانا بەخشین و وشەی ڕەسەنی تایبەت بە حەیران وجوغرافیای ڕاستی شوێنەکەی تێدا نەبوو ئەوە حەیران نیە بەڵکو شێواندنی حەیرانە، نموونە:

حەیران لە دیمەکاری* دەچومە کێڵێ کیستانێ لۆ ڕاوو شکاری* کارمامزەکم هەردەستاند دەمگرت لەناوەندی شاری*

دیمەکار لەکێ و کێڵێ کیستانێ لەکێ و مامز ڕاوکردن لەشاری لەکێ، واتە مانا بەخش نیە و لە ڕاستیش دوورەو خەیاڵیش قبووڵی ناکات.

★ تکا دەکەم لە نووسین وشە ڕێزی مەکەن بەتایبەتی لە ڕووی فۆڕم و ڕوخساری فۆلکلۆری و کەلتورەوە چونکە ئەوە دابو نەریت و ناسنامە و کەلتوری گەلێکە ئامانەتێکی گەورەیە، ڕوون و ئاشکرایە هەموو گەلانی جیهان کەلتور و دابو نەریتیان تا ڕادەکی زۆر جیاوازە، سوپاس بۆخودا ئێمەی میللەتی کورد لە گەڵ ئەو هەموو نەهامەتی و کاریگەری دەوروبەرەی کە ساڵەهای ساڵە لە سەرمان بووە، دەتوانم بە شانازیەوە بیڵێم خاوەنی دەوڵەمەندترین خەزێنەی کەلتورین ئەگەر کۆی بکەینەوەو برەوی پێبدەین و بیانپارێزین و بیاننووسینەوەو لە سینگەکان دەربازیان بکەین چ بەنوسین چ بە تۆماری دەنگی چ بەوێنەی دیکۆمێنتاری و بە ئەرشیف بکرێن، ئەوا نەوەی داهاتوومان کەڵك و سوودی خۆی لێوەردەگرن و داهاتووەکی زێڕین دادەمەزرێنن لەسەر ئەو ڕابردووە پاك و بێگەردو پرشنگدارەی پێشان .

هەرلە برەوو گەشاوەبێ بواری کەلتور و فۆلکلۆر و ڕەسەنایەتی باب و باپیران کە سەرچاوە و ڕێنیشاندەری هەموو بەرهەمێکی بەپێزن بۆیە جێی سەر بڵندی و شانازیمانن هەردەم .

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن نەتەوەی کورد زۆر زۆر دەوڵەندە لەم مەیدانەدا، لەکۆتاییدا؛ دەڵێم ئەو قەڵەمانەی گرنگی بە بەرهەمی فۆلکلۆری و کلتوری و کەرستە و کەلەپوورو ڕەسەنایەتی دەدەن هەر بە بڕشت و نەمری دەمێننەوەو بۆ نەوەکانی داهاتوو دەبنە بناغەو بنچینەیەکی هونەری بەپێزو ڕێزلێگیراو، دەبێ لێکۆڵنەوەی زانستی و ئەکادیمی و توێژینەوەیان لەسەربکرێ و ببنە فەرهەنگ بۆ نامەی دبلۆم و ماجستێر و دکتۆرا، بۆیە دەڵێم هەر پرشنگدارو گەشاوەبێ زانستی فۆلکلۆرو هونەری گۆرانی کوردی بەهەموو بەشەکانییەوە لەسەرووی هەموویانەوە لاوك وحەیران و بەستە و مەقامی ڕەسەنی کوردی.

## چۆنیەتی گۆتنی حەیران

★ باشە بابزانین ئەوانەی دەیانەوێ حەیران بچڕن یان بڵێن پێویستە یەکەم جار چی بکەن؟ کێبن ئەو کەسانە لە کچ و کوڕ یان پیاو و ژن ؟ چ دەقێك بژارکەن باشە؟ بە چ جۆرە ئەدایەك ئەدای بکەن؟

★ دەبێ لەناخەوە حەزی لە حەیران بێت حەیرانی حەیرانبێژەکانی پێشان و باشەکانی ئێستا گوێ لێبگری ولێان فێربی لە گۆتندا چۆن دەستپێدەکا چۆن لە ناوبەند دەڕوا چ گرنگییەك بە دوابەند دەدا لەڕووی گۆتنەوە ڕەچاوی بەرزی و نزمی بکات، وشەکان بەپاراوی دەربڕی و قووتیان نەدا.

★ ئەوەی دەیەوێ ببیتە حەیرانبێژ کێبی ئایا هەرچی ڕاستبیتەوە خۆی لەحەیران بدا ئەوە چیە دەنگی خۆشە نەخێر،حەیران کەسی خۆی دەوێ بەڵگەش ئەوەیە دەپرسم ئایا دەنگی مامۆستا حەسەن زیرەك و ماملێ و مامۆستا تایەر تۆفیق ... خۆش نەبوون ئەدی لەبەرچی خۆیان لە قەراغی حەیران نەداوە.

★ مەرجەکانی دەنگبێژی

١/مەرجی سەرەکی دەنگبێژی دەنگخـۆشی و شارەزابوونە لە نزمەکان نزمی بەیات لەپێش ئەوانی تر وەکو حیجاز و سەبا .... هتد.

٢/دەقەکە بەپێزو پڕمانا و کورت وپوخت و ڕەسەن بی شایستەی دەنگەکە بێ و بەپێچەوانەوەش هەروایە دەقی جوانیش بەدەنگی ناخۆش خەسار نەکرێ .

٣/شارەزا بوون لە ئەداکردنی دەقی حەیران بەگشتی.

٤/هەستی مۆسیقی وشارەزا بوون لە نۆتە و تۆنە دەنگییەکان .

ئەوە دروستە بۆ هەموو جۆرەکانی هونەری گۆرانی بەگشتی، گۆرانی، بەستە، مەقام و لاوك، حەیران، هۆرە، سیاچەمانە، بەندبێژی، بەلۆرێ، سەردوولکە..هتد

بەڵام حەیران جیاوازییەکـی زۆر تایبەت تری هەیە زێدە لە هەموو هونەرەکان :

دەقی حەیران کورت و مانابەخش بێت و بەدەرنەبێ لە وشەی شێوەزاری دەشتی هەولێر، زادەی وشەکان کەلتووری و فۆلکلۆربن زۆر باشترە یان تێکهەرکێشەکی تازەگەرییانەی سنووردار بکرێ، بەڵام بەمەرجێ وشەی زەقی تەکنەلۆجیای سەردەمی تێدا نەبێ چونکە حەیران وەری ناگری نموونە:

گاز دەکەم دەرێم باخەکەی شاری لە من بەتاق و کولانکە و کۆتـرە*

کوڕ دەرێ: کیژێ حەیران چبکەم بەدەستە خۆم نیە زێدە لە کیژو کارێ گوندی هەر ئەتووم بەدرە*

ئەگەر خوا بکا بابت ئەتووم بداتێ ئەوە دەتبەمە ناو قەیسەری و دوکانی هەولێرێ ئەوجا بە کەیفی درێ خۆت زێڕو زێدەباری و تاقمێ بوکینی هەرگرە*

★ ئەو کەسانەی حەیران دەڵێن پێویستە خۆپارێزبن و لەڕووی کەسایەتییەوە ڕاستگۆبن.

زمان پارێز بێ لەهەموو جێیەك حەیران نەڵێ بزانێ بۆ کێی دەڵێ وەکو دەڵێن زێڕ لە لای زێڕنگر بەقەدرە نەك لۆ کەسانێکی بڵێ مقۆ مقۆ و دەنگە دەنگ و سەر لەبن گوێی یەك نان و هەست ڕانەگرن، چونکە ئەوانە لە ماهیەتی حەیران و خودی حەیرانبێژەکە کەمدەکەنەوە.

دەبا بزانین لەدەنگ و دەق و ئەدا کیهانیان گرنگترن، ڕاستە بە خۆم دەق نووسم و حەیران و بەستە و تەنانەت ناوە ناوە لاوکیش دەنووسم، بەلام دەنگ و ئەدام پێ لەدەق لەپێشترە، نموونە : لەڕووی دین و دونیاوە جوانترین دەق (نص)ی قورئان و ئەلاهو ئەکبەری بانگدانە وایە یان نا؟ بەلام ئەگەر هاتوو قورئان بەدەنگی خۆش نەخوێندرێ بانگدەر دەنگ و ئەدای تەواو نەبوو چی لێدێ؟ بەلام ئەوە مانای ئەوە نیە دەق پیرۆز نیە یان مەرجەکی لەپاشترە، ئەگەر هات و دەقەکە ڕەسەن بوو کورت و سێ بڕگە و مانا بەخش بوو دەنگەکە بەسۆز و کاریگەر بوو و بە جوانی ئەدا کرا ئەوە لەوێدا د. مەولوود ئیبراهیم حەسەن گوتەنی وەکو شانەی هەنگوینی ساف و بێگەردی خۆمانە شیلەی لێ دەتکێ و حەیران دەگاتە لووتکەی خەونی هەوادارانی.

١/ جارێ لەلای هێروە هونەری دەنگبێژی حەیران لە ڕووی گوتن و دەق و ئەدا تایبەتە بەگەلی کورد و زادەی ناو کۆمەڵگەی کوردەوارییە لە گوند و دەشت و دەرو جۆتیاری و شوانی و ناو کۆڕی دیوان و مەجریس و ناو هۆبەو ڕەشماران سەری هەڵداوەو هونەرەکی زۆر کاریگەرە لەسەر دڵەکان چونکە سەرچاوەی لە دڵدا گرتووە.

٢/ حەیران لەڕووی دەقەوە تەنها لەسێ بەندی سەرەکی پێك دێت (سەربەند واتە دەستپێکی حەیران، ناوەندەبەند واتە ناواخنی حەیرانەکە یان دەقەکە، دوابەند واتە کۆتاییهاتنی پەیامەکە) ئەوەیان لەڕووی ئەداکردنەوە لە هەردوو بەندەکەی تریان گرنگترەو مەیدانی قۆشمەی حەیرانبێژانم ئاولێناوە لەوێ بەهرەکە بە دیاردەکەوێ چونکە پەیامی حەیرانەکە لە ڕووی دەنگ و ئەداوە تەسلیم دەکات دڵی هەوادار و گوێگری حەیرانەکە دادەیەخی و ئاودەخواتەوە و تامەزرۆی دڵە عاشق وبریندارەکانە سارێژی خەمەکانی کەون و نووە.

۴/ حەیران وەکو گۆرانی بەیەك تەبەقە ناگۆترێ، لەهەر شوێن وجێیەك تایبەتمەندی خۆی هەیە، نموونە: لەناو خانەوادەکان و کۆڕومەجریس و دیوەخانان بە نزمی یان تەبەقەی نزم و مەجریسی دەگۆترێ تەنانەت وشەکانی ناو دەقەکەش زمانپارێزیان لێکراوە نموونەیەك لەوجۆرە دەقانە دەهێنمەوە:

هوڕە دەیگۆتە کزەی شەماری*

دەك هەزار خۆزگەم بەتوو کا وەکی لۆ خۆت دەدەی لە سەرو پەرچەمی حەیرانێ دەبزێوی شازولفان لەگەر شەدەکەی لاری*

ئەو خۆشیی سەرێ چەند سارانە لەگەر حەیرانێ خۆم دیت لە مەنتکاوەو مامۆستایان ئەو سارەکە هەمووم دانەوە بە خەم و تاری*

بەلام وەکی لەپێدەشت و دەرو شوێنی کارو سەرگردو شاخ و دانیشتنی بەرسێبەری بەری دروونە و شینایی و یان لەدوو مێگەلە مەڕەوە دەڕۆیشتـن ـ هتد، بەدەنگێکی بەرزو هەوایی و برند دەگۆترا یەکەمیان چونکە چۆلاییە، دووەم گەیاندنی پەیامەکەیە بۆ شوێنێکی دوورتر لە مەجریس و دیوەخان، زۆرجار حەیران لەبەینی خۆشەویستان لە کچ و کوڕو دانانی جێژوان و گلەیی و گازادە و دڵخۆشی گێڕانەوەی دەست لەملان و شان و ملیێ بەکەزی و ڕامووساندا وشەکانیش بێسنووریان پێوە دیارە، بۆنمونە :

دەمەڕۆ مەڕۆ بابتگەمێ هۆ هۆ کیژۆرە جوانێ*
ئەتوونازانی ئەوە سەرێ چەند سارانە جەرگ و هەناوو درم لە دووری توو دەکاتن جۆلانێ*
بیستیتم دەرێن دەچنەوە بنەگەو هەواری ئەمن دەردێ مردنێ خۆم گەلە پێ خۆشترە لە دەردێ دووری ولێکدابڕانێ*

حەیران گۆتنی نزمی غەریبیشمان هەیە کە زۆربەی  وشەکانی دەچێتە باری خەماوی و جەرگسوتان و ئەویندارو خۆشەویست لێکدابڕان ئەوەیان لە هەموو نزمـە دەنگەکان کاریگەرترەو وشەکان گریاناوی و ناخهەژێنن، زیاتر لەپیاوان ئافرەت لە کاتی پرسە و کارەساتەکاندا دەیرێن، کە بەداخەوە ئەو میللەتە ستەمدیدە لەوەتەی هەیە لەناو خەمی خاك و میللەت و ئەو کوشتن و بڕینەیە، نموونە:

ئەوڕۆ برینی کەونو نوم هەمووی لێکرا کولاوە*

ئەوە جێژنەی قوربانێ هاتەوە دیسان یادی کارەساتی یەکی شوباتێ گەڕاوە*

داخەکەی گرانم کەسەرەکی گەلە گەورە بوو هەتا ئەوێ ڕۆژێ دەمرم ئاخ و کەسەرێ ئەوان شەهیدان نابی تەواوە*

جۆرەکەی تری حەیران شێوەگۆتنی حەیرانی ئایینیە کە زۆر لە کۆنەوە هەبووە دەتوانین بڕێن شێوی گۆتنەکەی لە بەینی غەریبی و مەجریسیە چونکە هەندەك جار

بەنیمچە برندی دەگۆترێ ئەوەش بەگوێرەی زۆری ئامادەبووان دەگۆڕێ یان هەندێ جا وەکو (نەشئە) یان گەرم بوون (حار) دەنگبێژەکە دەنگی گەورەتر دەبی بەتایبەتی لە تەکیەو خانەقایەکان و ناو حەلقەی زکری دەروێش و عاریفان، بۆ نموونە :

وەی نایێ وەی نایێ*

چەندی هەستێ خۆم ڕادەگرم دەنگی شێخ عەبدولقادری بازەڵلا نایێ*

لۆمەی درێ من مەکەن هەر چەندەکی هەستێ خۆم ڕادەگرم ئەوەی خۆشیبی نەمایە لەسەر دنیایـێ*

بۆیە دەتوانین بڵێین : حەیران بەگشتی ، سۆزە، عەشقە، خۆشەویستی دوو ئەویندارە، سروشتە، جوغرافیایە، جوانی ئافرەتە، هەستی پاکە، ناوو نهێنی پارێزە، خۆزگە و ئاواتە، شیوەن وخۆشی و یادو یادەوەری و لێکدابڕان وجێژوانی دۆست و دەستگیرانە.

ئەو هەویرە ئاوەکی زۆری دەوێ لەبەر ئەوانە و چەندان پێوەری تر، ئەوانەی حەیرانبێژی ڕەسەن و هەوادارو گوێگری حەیرانی ڕەسەنن حەزناکەن ئەو هونەرە بەرزە ناوازەیە بشێوێندرێ، نموونەی هەرە بەرزیشمان لە بواری هونەری حەیران دەنگ و گۆتن و ئەدای حەیرانی حەیرانبێژە کۆچکردووەکانن، کە بەشی زۆریان قوتابخانەن، بۆیە نەوەی ئێستا و داهاتوو دەبی شانازیان پێوەبکات، یەك بەخۆم بڕوام پێ بکەن حەیران بە مانای وشە و دەنگ و ئەدا حەیرانبی حەیرانم دەکا و برینم سارێژدەکا .

چونکە ئەگەر کەسێك بەڕاستی عەشقی حەیران بی کەونە برینی بەحەیران هەم دەکولێتەوە هەم سۆیەکەی دادەکەوی بەڵام ئاخوو بێفایدە برینی کەونە دۆست و یاران بڕوا بکەن هەتا ڕۆژێ مردنێ نەسارێژ دەبی نەدەرمانی هەیە نەدەگری قەتماغێ بۆیە حەیرانبێژی ڕەسەن و دانەری حەیران لە قەراج و کەندیناوە مام (خورشید فەقێ عەزیز شەناغەیی) گۆتیتی :

قەراج قەراجە قەراجۆك لێژە*

مارێ بابی حەیرانی بارکرد هەواریان دوورە و مزریان درێژە*

(مزریان واتە مەنزلیان)

برینێ شیران و تیران دەگرن قەتماغێ برینێ کەونە دۆستەکانی بەشەرت و بەقا و متمانە هەتا ڕۆژێ مردنێ لە جەرگێ من قەت نابنەوە سارێـژە*

وەڵا ڕاست و دروستت گۆتیە هۆ سوڵتانی حەیرانبێژان باپیرە قوشە دە هەموو بڵێین هەزار ڕەحمەت لە توو و هەموو حەیرانبێژانی ڕەسەن، تەمەن درێژی لۆ ئەوانەی درێژەپێدەری ئەو مەیدانەن.

بابی ڕەحمەتیشم دەڵێ :

گەری بەگەری نۆری بەنۆری* لە ملی حەیرانە جوانەکەی مندایە خەناوکەکی سێ ڕیز پڕ لە مەرجان و مۆری* ئەوە پێنج شەموو جومعەیە بە کۆرایی چاویان حەیرانەکەی من دەبەن بە نابەدری چەندە شیرین دەیخەمرێتن بە کەسك و سۆری*

لە کۆتایی دەرێم ئەرێ گەلۆ هەرچەندی هەستڕادەگرم وەکو خۆم بەدەگمەنیش تەنها یەك وشەی کوردی نابینم لە ناو دەق و شیعری عەرەبی ئەرێ کاتی ئەوە نەهاتووە خۆم یەکەم جار نووسەر و حەیرانبێژان و حەیراندانەران پیتی (حێ)ی وشەی حەیران بکەینە (هێ)ی کوردی واتە ((هەیران))؟.

ڕێنماییەکی گرنگ بۆ ئەو حەیرانبێژانەی دەیانەوێ حەیرانەکانی من بڵێن:
(هەندێك وشە دەخەمە ڕوو بۆ دەستپێك یان بۆ سەر بەندی حە یرانەکان وەکو : ئەوجا دەرێم ـ ئای براینە یان کاکینە ـ ئەوڕۆ هێواری، یان سبیانێ بەپێی کاتەکە ـ نازانم لەبەر عاجزێ درێ خۆم بە کێندەرێدا هەربرێم ـ دەمەڕۆ مەڕۆ ـ یان تەنها وشەی حەیران بەدرێژکراوەیی دەنگ ـ ئای بابە ـ ئای ئای یان ئۆی ئۆی یان وەی نایێ بەدرێژکراوەیی ـ ئەدی نەمدەگۆ یان لەبەر خاتری ئەو مەجریسەی گاس دەکەم دەرێم ـ ئەرێ حەیران ... هتد.
تێبینی: حەیرانەکانم لە سەر شێوەزاری دەشتی هەولێر و قەراج و کەندێناوە نووسراون، نموونە (در) واتە دڵ، (خین) واتە خوێن، (لەگەر) واتە لەگەڵ، (دەرێن) واتە دەڵێن ... هتد.

نوسەر:

هەولێر

# دەقی حەیرانەکان

حەیران١

حەیران حەیرانە حەیرانەکەی من جوان و نەجیبە*

خۆ ئەگەر ڕۆژەکێ حەیرانە گچکەلانەکەی خۆم نەبینم وەکی دێ و دەچی لە ناو باخچەو ڕەزان خۆم گەلەك بێعدورو غەریبە*

دەمگۆتە خزمان و برایان ئەگەر دنیا بوو نەخۆش کەتم مەمگێڕن لەسەر چاك و پیرو دوختۆران بەس وەبکەن دەست و پەنجەی حەیرانەکەی خۆم بمگاتێ هەر ئەو لۆمن شفا و دەرمان و تەبیبە*

- بێ عدور: واتە بێ زەوق و بێ ڕەنگ و ڕوو و نەهاتنە پێش چاو.

حەیران ٢

لەوەتی مارێ بابی حەیرانێ چووینەوە بنگەو هــەواری*

ئەوە سەرێ چەند شەوانە چاوێ من نەچویتە خەوێ ئەو درە غەریبەم بە بارەکی خەمان دەنــاری*

خەمێ لە درێ من عیلاج ناکرێ بەداوو دەرمان و نوشتەو کشتەکان ئەگەر پەنجەی ئەو ناسك بەدەنەم نەگاتێ زۆر زەحمەتە بکرێ تیمــاری*

حەیران ٣

سەرێ من گەڵەگەلە دیێشی درێ من بە ژان و کولە*

هەرچەندی دەکەم حەیرانێ خۆم نادەنێ خۆم لێ پشتگەری دەکەن

کردیتیانە عینادی وملە*

ئەوە سەرێ دوو پێنج شەمانە حەیرانێ خۆم نابینم بێتەوە لە کۆرو قەسارێ ئەو گوندە جوانەی خۆمان لەپێش درێ من هەر دەرێی کاولە*

## حەیران ٤

دممەڕۆ مەڕۆ با بتگەمێ هۆ هۆ بەرەك چاوێ*

بابان ئاوەدان ئەتوو ئەوەندە جوان و زەرد و تەنكی بێ چاوی بی چ كل و كلدان و زێڕ و زەبەندی شارانت پێناوێ*

ئەمن لە شارەكەی هەولێرێ لەجیاتی خەزێم و گوارە و كل و كلدانان لۆتووم هینایە شووشەكی گوراوێ *

## حەیران٥

ئەستێرەكم لێ هــەرات لەلای بەیانی*

ئەوە شەوقێ خۆی دەداتەوە لە دەراوێ گردەسۆری ئاقاری پۆڕیجەو سێنارەو ئیلنجاغی ڕۆنی دەكردەوە بانیێ خەلیل ئاوڕەحمانی*

دەرێم كیژی بەگـزادە دەلۆم وەرەوە جێێ ژوانێ بەینی لەودەو كاولە خانیان بەینی عیشاو مەغریبێ توخوا دەبا كەس پێنەزانی*

## حەیران ٦

دەچمەوە كاولە سێنارەی لەلای ڕۆژ ئاوایێ كەندارەسـۆرە*

ئەوە حەیرانەكەی من لەگەر دەستە خوشكانی دیتەوە لە گۆمێ شیرناوێ زێدە لە هەمووان كراسی لەبەری مەخمەری بە گـۆرە*

گەلە خۆشە حەیرانێ بەدرێ خۆت لەگەربی لە جێی ژوانێ ئەوجا لە ئامێزێ بگری بۆنكەی خارێ گەردەن و چەرخێ ڕومەتان ئەدی نەمدەگۆ نۆرە بە نـۆرە*

حەیران٧

گەله نەخۆشم نازانم زیده له جاران لۆ ئەوها درم خەتەران دەینی*

دەنگۆ جوابەکم لۆ بدەنه سۆره جوانێ دەبا بەزار لۆم بکاتن تەگبیرێ جوابێ دیم لۆ بدەنه حەیرانه گچکەلانەی خۆم دەمەکێ لەپێلینگانم دانیشی فرمێسکانم لۆ دابارینـی*

جوابێ دوایێم لۆ بدەنه بـەژنەکەی باریك نەرم وحەلیمەکەی زەردو تەنك دەبا سەرم دانێته سەرڕانی بەپەنجەیێ نەرمۆکه دەمەکێ سەرم ڕابژینی*

حەیران ٨

لەدووری بەژنێ باریـك درێ من بەنکه نکه*
ڕومەتی حەیرانێ دەچویتم بەهەناری شارەبان بەسێوەکانی لاسۆری باغی شنۆیێ ناوەلا ماچی گەردەنێی بەوان هەنجیرەکانی سەرلکه*
ئەوه سەریێ چەند ڕۆژانه ئەو غەدارداکه لەمن لالووته دەمگۆ توخوا حەیران دەوەره گلەییانم لۆبکه بەس بەقسەی بەدکارانم قەد لەگەرمەکه*

حەیران ٩

دەوەره وەره هۆهۆ یارەکەی ناسك وجوانم*

کیژێ دامەن شۆڕ ئەتو باش دەزانی خۆ ئەمن چ دەمان بێ نازی چاوه جوانەکانت ناتوانم*

ئەتوو نازانی له دووری توو نەخۆشم کەتیمه  له ناوجێ و بالینگانێمه دەوەره هەر بەخۆت بەپەنجەیێ نەرمۆکه بکەوه هەتوانم*

حەیران١٠

دەمگۆت حەیران ئەوەندە ناسك وجوانی هەر دەرێی پەڵکی گوری*

بۆنی گەردەنێ تووم خۆشترە لە بۆنی ڕەشەڕەیحان و نێرگزو هەڵاڵە و قەنەفـری*

کەینێکە لۆم دیێە وە ژوانێ هەتا بەکەیفی خۆم ڕاتبگوشـمە باوەشێ هەتا کفتایی درم دادەمـری*

حەیران ١١

دۆرەزە لەگردی باشتەپە لەنەرمانی*

مارێ بابی حەیرانێ باریان کرد ئاوابوون لە زوورگەزراوی سیانان دەرێن هەواریان گرتیە لە ئاقاری بیرەبات و جاستانی *

ئەمنیش سوار دەبوم لە بۆرەیێ خارخار دەمکوشی ڕستێ جەرەوێ بەهەنجەتی ڕاوێ لەجیاتی ڕاوی مامزو کێروشکان دەمەکێ لۆ کەیفێ دریخۆم حەیرانم دادەبڕی لە دەستە خوشکانی*

حەیران١٢

حەیران چەندم پێدا هەرگۆتی لەسەروچاوێ*

بەژنت برندە چاوانت ڕەشن گەردەنت زەردە لێوانت لەخۆڕا سۆرن چ دەرمانی پێنـاوێ*

خۆزگەم بە زەمانی کوڕینی وەکی دەهاتمەوە لە شەوینێ حەیران لۆم دەهاتە

پەناپانکەیێ ڕەشمارێ لۆ خۆمان دەمانکرد شـەوڕاوێ*

حەیران١٣

ئەرێ دەبا جارەکێ پڕ بەدرێ خۆم بتگەمێ هۆ زێدەجوانەکەی بێ پـەرە*

ئەوە چەند ڕۆژە ڕفت و ڕۆینت نابینم لەناو ڕەزو باغان خۆ نە سەر دەردەینی لە کۆشك و تاق وپەنجەرە*

ئەدی نازانی ئەو درە کەسادو ماروێرانەی من لە دووری بەژنێ باریکت شەوو ڕۆژ پڕلە ئاخ و دەردو کەسەرە*

حەیران١٤

دەمگۆتە حەیرانێ ئەتـوو ڕۆژ لە ڕۆژ لەپێش چاوو درێ من جوانتری*

چەندی سێرەی تفەنگێ دەگرمە ئەوێ کارمامزێ چبکەمێ جێیی نیشانان لۆ من ناگری*

زۆر دەترسێم نەگەمە مرازو مەخسوودێ لە درێخۆم لێم ببنە دیدارو حەسرەت ڕوومەتەکانی سۆری گورگوری*

حەیران١٥

بەپێش دەرکەیێ مارەبابی حەیرانێ داهاتم دەستێ خۆی گرتبوو بە دەرکەکی سێـدەری*

بەچاوێ بەگریان ولێوەکی بەبار دەیگۆ لاوێ نەرمۆکە ئەتوو نازانی ئەوە لە سەرە من خڕدەکەنەوە دەرارو موشتـەری*

دە ئەوجارەش بنێـرە داخوازیم ئەگەر ئەمنیان نەدایێ ئەوجا حەقی خۆتە بەگەرت کەوم هەر بە کراسێ بـەری*

حەیران١٦

چەندم گاسکردی کیژۆرە نازی*

ئەمن بەژنی توو دەچۆینم بە دار سەروەکانی باغی عەنتابی ڕومەتت بە هەناری شارەبان گەردەنی سپی و درێژت بە گەردەنی قورینگوقازی*

خۆ ئەمن شەرتمکردیە بە گەورە کوڕی بمینیمەوە نەچمە داخوازی چشتاقە قورینگوگۆزەران بەخوای لەتوو بترازی*

حەیران١٧

حەیران بە قەراتان بە قەراتێ کاولە دوینێ*

ئەوە سەرێ چەند سارانە لە دووری حەیرانێ هەناوم بوویتەوە گۆمەکی خینێ*

ئەوە پێشمەرگەمە دەچمەوە گەرمەسێرێ بەداخەوە دووچاوێ بەرەك بەتاقی تەنێ بەجێدەمینێ*

حەیران١٨

کیژدەیکۆ کوڕەتیمەلاوە ئەمن مامزم مامزەکی سۆرو سپیمە*

سەر لە سبەینان لەلانــێ سۆرکانێ بەتاقی تەنێ لە بناری زوور و قەد پاریمە*

کوڕەتیمە حەیران ئەگەر ئەتوو ڕاوچییەکی چاکی ئەمن مــحەلی ڕۆژئاوایێ لۆتوو لە سەروچاوەی کاولە دەربەندیمە*

- بیرۆکەی ئەو حەیرانەم لە حەیرانێکی خارە ئەحمەد مەردە ی شەناغەیی وەرگرتووە وەکی لەسالّی ١٩٩٢ لە گەلّ بابم حەیرانی دەلّێن.

حەیران١٩

حەیـران ئەمن لە برندانت دیمێ ئەتو سەبر سەبر لۆم وەرە لێـژی*

ئەوە سەریێ چەند سارانـە ئەتوو مایەوە لەمارەبابان لەناو کەسەران هەر بە گەورە کیـژی*

خوایە ئەتوو بکەی سەبەبکارمان هەر سارێ یەکەکیان لەمارێ بـمری هەتا سار دوازدەی مانگێ غەم و تاریان بچێـژی*

حەیران ٢٠

هەزار خۆزگەم بە زەمانی پێشان و دەوری بەرێ*

شەو نەبوو دوو سێ کیژ لۆم نێنە جێراوگە و ژوانێ نەمدەزانی نە ماچکەم کەرخێ مۆری و مەرجانان نە بۆنکەم شەمامەکانی باغەرێ*

ڕۆژهەتا ئێوارێ دەرێم تازە ناگەمەوە ئەوێ دەورو زەمانی لـۆیی دەترسێم بمرم بەوێ ئاخ و کەسەرێ*

حەیران٢١

حەیراًن لە داوگە میلی*

حەیفم دەمینێ ئەتوو سەریێ چەند سارانە مایەوە بە قەیرەیی وەکی کەوەکانی ناو قەفەزێ ئەسیرو دیلی*

دەوەرە ئاوابین لە قەرەچوغ و زورگەزراوی بگرینەوە دەشتی شەمامکێ و بەڕانەتی دەربازبین لە شێخ تورابی بپەڕینەوە لە ئاوێ قەندیلی*

## حەیران٢٢

ئەوڕۆکە دڕێ من پڕئاخ و داخە لەبەر نارەنارێ برینداران لە ڕۆژئاوای کوردستانێ*
دیسان هێرشی تورکانە داخەکەم لۆ خاکێ کوردان لە گرێ سپی و سەرێکانی و کۆبانــێ*
چەندی هاواردەکەم کەس لە هاواری مە نایێ خوایە تەختی زالـم و بێبەختان وەر بگێڕی ئەوە پیر و جوان و منداری ساوا بێ سووچ و تاوان دێتە کوژرانێ*
((لە١١/١٠/٢٠١٩ دوای لەدەستدانی قاچی کچێکی حەفت ساران بە ناوی (سارا)
و شەهیدکردنی برایەکەی))

## حەیران٢٣

ئەنگۆ نازانــن دەردەکی چەندە گرانە دەردی پیری و یەختیــاری*

خۆزگەم بەوێ زەمانی کا وەکی شەوی پێنج شەمان دەهاتە گوێم دەنگێ دۆرێ و فیقەی زوڕنایێ خۆم لۆ نەدەگیرا ڕێیی دوو گوندانم دەبڕی هەر بەپیادەی نەك بە سـواری*

داخەکەی گرانم ئەوە پیربوویمە پشتم چەمایە شنگ و تاقەتێ جارانم نەمایە بە لەقە لەق شەقاوان داوێم ئەویش بە گۆپـاری*

## حەیران٢٤

لە زووری شێخ ســمایـلی زەینێ خۆم دەداوە ئاقاری گێسومە و چەرتی*

کچێ ناولەپ جوان ئەوە سەرێ چەند سارە دۆست و گراوێ خۆمی دەرێی لەپاشە کشەی لەگەرە من بەتەمای بکەی کەم شەرتی*

دەوجا کیژۆرە جوان دەیگۆ نابەخواو پێغەمبەران ئەمن هەر لەسەر قەول و قەرارێ جارانم ئەمان گەلە مەترسیان دەکەم نەیار و بەدکار لەگەرەمە بکەنەوە بێبەختی*

حەیران ٢٥

ئەوە هاتەوە مانگی ئاداری دیسان شیندەبنەوە کوریکە نیسان و مێلاقە*

دەنگۆ زەین دەنە کۆشکی ماری بابی حەیرانە جوانەکەی من لەمن بەتاقە تاقە*

کیژ دەیگۆ کورە حەیران ئەوجارە لۆت دیمەوە جێژوانەکەی لەجاران بە کەیفی دری خۆت بترازێتە بەرموژەو سنجاقە*

حەیران٣٦

جوابەکیان دایمێ دەرێن حەیرانەکەی توو وا دەڕوا سەر بەهەوێ*

بەناوێ خودای لەوێ ڕۆژێوە چاوێمن بە چ کولل و بابەتان نەچوویتە خەوێ*

ئەوجا دەرێم هەرچی باعیزێ دوو درانە خوایە گیان دەردەکی بگری لە پەل وپۆ بکەوی کۆرایی لە هەردوو چاوانی کەوێ*

حەیران٣٧

حەیران حەیرانە حەیـران زبێدە*

گەلە نەخۆشم سەرێ چەند مانگانە بێناز کەتیمە لەناو نوین وجێدا*

دەمگۆ دەبی خێرخوازەك هەبی جوابەکم لۆبداتە حەیرانێ بێ سەرم دانێتە سەر ڕانەکی نەرم و شل دەمەکێ بە زەندەکی بە بازن سەرم ڕابژێنی وەبزانم ئەودەمی چاك دەبمەوە لەوێـدا *

حەیران٢٨

دەمگۆتە حەیرانی بەبیرت نایی وەکی مارێمەو مارێتگۆ بەرامبەر یەکدی بوو*

خوانکا ئەگەر بێتوو ئێوارەکی ئەتووم نەدیتبایێ ئەوی شەوی هەتا سبیانێ خەوم لێدەزڕا لاکەلەکەکم چۆل دەبوو*

ئەوە زانیتم دەرێن پیرەبابەکەت ژنبەژنیت پێدەکاتن بەخوای ئەگەروابی ئەوە یەکجاری مارم لێخرابوو*

حەیران٢٩

لە شەناغەیێ ڕەنگین دەچوومەوە سەر قوچەکـە برنـدی*

نەمدەزانی بە کێندەرێدا هەربرێم دەمگۆ بە ئاقاری سەربەشاخ و قوچ و دەربەنـدی*

دەمگۆتە حەیرانی ئەتوە سەرێ چەند سارانە دۆستی خۆم بووی کەس پێی نەدەزانی ڕووی ئاحەزان ڕەشبیتـن لە هیچ وخۆڕایی لەمنیان کردی*

حەیران٣٠

شەناغە و گەزوەشان دەوزێ و دەوزێیە*

کیژۆرە جوان دەرێ کورە حەیران دەوەرە هەموو سەر لەسبەینان سەر و سواریت ببینم لەسەر خانەی زینی جوانە ماینەکەی شێـیە*

دەوەرە شۆڕکەوە ڕستێ جەرەوێ بچینەوە کەنێناوە و قەراجێ چونکە مەفتەنێ باب و باپیرانە هەتا ئەو ڕۆژەی دەمرین هەرچاومان لێیە*

حەیران۳۱

لەبناری دارە خەجیجەی چاوێ خۆم دەداوە ئاگرەکەی سارەلو و سەربەشاخی*

لە گۆیانم خۆش دەهات چریکەی پۆرو سووسکەو کەناچان لەگەر هاتەهاتی ڕاوچیان لەناو کفرو گەزان تێکەردەبوون لەگەر فرمەیێ وراغـی*

حەیرانەکەی من مامـز بوو توردنی دەبوو هەرچەندیان دەکرد پێیان نەگیرا بزریان دەکرد لەقەد بنارو شاخی*

حەیران۳۲

حەیران لە بنەبنەیێ چیایەکەی پیرە سەفینی*

ئەوە دونێکە لەجێێ ژوانێ دەمگۆتە حەیرانێ دەبی بە حەراری ئەتووم بدەنێ هەتا بەخۆم هەر دەمەوە تاراێـێ بوکینی*

ئەوجا کەپرەکت لۆ بکەم هەراشی لە ڕەشەڕەیحانی قەدی لەپەلکی سۆرە گورێ چار دەوری لە شەوبۆیی تکتکەی ئاویی لەناوەندێ بێتە خوارێ لەسەر دەراوو کانیێ دۆری هیران و نازەنینی *

- زۆر لە حەیرانبێژان حەیرانی لەو بابەتەیان گۆتیە بە شێوەی لە یەك نزیك لەوانە مامۆستا ڕەسول گەردی ـ مەحمودی سەید بەسێی باشتەپەیی ـ ....هتد

حەیران٣٣

برازینە لەبانیێ خەرمانان  زەینێ خۆم دەداوە کفـرە دۆڕێ*

هەموو ئێواران دەوبەستی شەرغەی ناو ڕولك و گەزان گەڵە خۆشە لۆ ڕاوە سووسکە و پـۆڕێ*

حەیرانەکەی من قورینگە لە تاقی عاسمانێ ئەوە هەریکردە با و بۆرانێ گەلە مەترسیان دەکەم ڕێێ لێ بگـۆڕێ*

- بنێ خەرمانان و کفرە دۆر : دووشوێنی بەناون لەدەو بەستی شەرغە و بناری دیدەوانی.

حەیران٣٤

حەیران حەیرانـە حەیـران چنارە*

گەردەنی زەردە لێوی تەنکە بەژنی باریکە هەر دەرێی دار ئەسپیـنداره*

دەمگۆتە حەیرانێ دەورە با بچینەوە قەراج و کەندێناوەی خۆ شنگ و تاقەتمان لێ بڕا هەرچەندی لەشاران هەرگرین کەسەرو خەمان ئەتوو نازانی چەند خۆشە ئەو دەشت و دەرو ئاقارە*

حەیران٣٥

ئەوە ئادارو نەورۆز هاتنەوە لۆ کەیف و سەیرانێ*

ئەوجا دەستی حەیرانـێ دەگرم دەچینەوە قەسر و ماکۆسان کەپرەکی لۆ دەکەم لە بانە شوانێ*

هەنگینێ دەست داوێمـە سەر شان و ملی بە هەوری و هیزار بۆن دەکەم شەمامە و بەندان هەر لەئێوارێ هەتا مەلا بانگدانێ*

حەیران٣٦

ئەوەپایز هات وەختی خەزان وەرانە*

بایێ هورەی دەدا لە سەر وپەرچەمێ حەیرانێ لەناو ڕەزو گورو باغانە*

ئەوە سەرێ چەند سارانــە ئەمن هاواردەکەم و دەرێم دەرمانی دەردێ عاشق و در بریندار و کیژ و کوڕان تەنها و تەنها جێراوگە و ژوانە*

حەیران٣٧

حەیران چەندم پێگۆتی لە زار دەراوێ*

توخوا غەداردالە لەپێش کیژ و کارێ گوندی ئەتوو ئەوەندە پەلاران ماوێ*

خۆمن شەرتم کردیە ئەگەر ئەتووم نەدەنێ لەخۆم حەرام دەکەم مار و ژن بەخوای قەت کەسم نـــاوێ*

حەیران٣٨

سنورێ کوردانە هــەر لە زاخۆی هەتا دەگاتە بەدرە و جەسان و مەندەلی*

جوابەکم لۆ بدەنە پێشمەرگەی کوردستانێ  با بەعام تەدارەکیان هەرگرن دۆشکە و قازیفان دانێنە سەرشان و ملی*

ئەوجارەیان عەلەمێ کوردستانێ هەردەدەین لە چیایەکەی حەمرینی یان دەبی شارەکەی بەغدایێ ببینن بە کاولی*

- ئەو حەیرانە شۆڕشگێری و نەتەوایەتی و جوغرافیای سنووریشە.

حەیران٣٩

کیژدەرێ وەی نایێ وەی نایێ هەی لەخۆم غەریب و ڕجا برایێ *

چەندی دەگەڕێم لە ڕەز و باغان بۆن دەکەم خونچە گورو ڕە شەڕەیحانان لە دنیایێ*

بێفایدەیە توخوا قەت قەتۆکە لێم مەگرن خۆ هیچیان لە دریێمن بۆنی کوڕە لاوکەکەی منیان لێ نایێ*

حەیران٤٠

دەمگۆ هەزار خۆزگەم بە دەوری هەسان و درونەو قەیناغ و داسی*

وەکی بەخۆم سەپان بووم دەچوومە گازێ نازدار حەیرانیش تێلە کێش بوو لە بناری دارەخەجیجە و مامەباسی*

ئەوە سەرێ چەند مانگانە دوورم لە بەژنێ برند و دوو چاوێ ڕەش ئۆقرەم لێهەر گیرایە نە دەزانم خەبەری خۆ نە باس وخواسی*

- قەیناغ: بریتیە لە پلێتێکی لوڵ دراو لەشێوەی پەنجەکانی دەست لە چوار پەنجە دەکرا نوکێکی درێژکراوەی هەبوو هەتا دەستی سەپانەکە لە درك بپارێزێ و سوارەکەی دەستی گەورە بێ.

## حەیران٤٧

لە زارگەلی بازاڕگەی زەیـنێ خۆم دەداوە لاوەرە و کەنـداری*

ژوانێ  گەورە کیژەکانی بە بەقا و متمانە گەلە خۆشە ئەوانی ماینەوە لە مارەبابان بەدەست و دیـاری*

وەکی کێشتانان دێتەوە لە گۆمێ شیرناوێ جەرە لە پشتێ جامیلکە لەدەستێ ئەوجا بۆن بکەی گەردەنێ زەردی پڕا وپڕ بەزاری*

## حەیران٤٨

حەیران لە دەو ڕوبارێ سفەییەی ناوەلا لەسەر جسرەکەی گوێـڕی*

ئەوە حەیرانە جوانەکەی من هەر نامە لەسەر نامە و نووکانم لۆ دەنێـری*

دەرێ کورە حەیران دەرێن  شەڕە لە دەشتی قەراج  و بنارێ حەمرینی خەونەکی گەلە ناخۆشم  دیتیە دوور لە سەری توو خوایە دەنا بەخێری بگێـڕی*

## حەیران٤٩

حەیران لە گرد قۆشەنێ*

ئەوە سەرێ حەفت سارانە سەبارەت بە دوو چاوێ توو ڕێتجبەرم لە گوندێتگۆ هەرچەندی دەکەم بەخۆشی ئەتووم نادەنێ*

ئەوە جوابەکی دەنێرم لۆ خزمان و برایان دەبا لۆمن بنێرن جوانە ماینەکەی خارخاری لێ سواردەبین پێکەوە ڕاناوەستین دەچینەوەکاولە مەفتەنێ*

حەیران٥٠

کۆمەڕێکێ سواران بەدەر دەکەتن لە گەروێ بەر ماران دەیانگرتەوە عارەبە ڕێیە*

وابزانم کوڕەلاوکێ منە دەڕواتن لە بەرایێ سواران تفەنگی لەشانی مەعلومە قۆنداغ بەگرێیە*

توخوا دە ستەخوشکینە ئەنگۆ قەت لۆمەی من مەکەن هەتا هەناسەم لەسەر دنیایێ مابی هەر چاوم لێیە*

حەیران٥١

حەیران لە کێلان لە کێلێ کیستانێ*

دەمگۆ کچێ دەوەرە با ڕفت و ڕۆینەکەت ببینم لە ناو ڕەزو باغان هەموو سەر لە ئێواران و سبیانێ*

ئەدی نازانی پاشی دووچاوی بەرەك و جوانت خۆ کەسیتکە نیە لۆم بێتەوە جێڕاوگە و ژوانێ*

حەیران٥٢

دڕکەو چەرت و گوێسمە سەرجادەو ڕێـیە*

مارێ بابی حەیرانێ ڕوو لە سێبەرێ پشـت لە کەندێیە*

هەتا ئەو ڕۆژەی بە دوو دەستە هەرمدەگرن دامدەنێنە سەرتاتەشوارو ناو دارەبازەی هەر تەمام پێـیە*

حەیران٥٣

گەواڕەکی دەهینا بـەبایێ ڕێژنەی چەند هورد دەباری*

دەیڕشاندەوە دەشتی قەراجێ ئاقاری قەراتەسۆران و مهێدی و کەلەشخان و دوازدەهـەواری*

حەیرانەکەی من دەهاتـەوە لەناو کۆزو هاوێرێ کارو بەرخان لێیدەدا تاوەکی بارانێ دایکی دەیگوت چاوم کۆرەبی هێشتان منداری*

حەیران٥٤

ئەوە کۆمەرەکێ سواران لە زەوییێ بەرماران دەچنە قۆشەنێ*

کوڕە لاوکێ من لەگەر وان سوارانە خوادەکا لەمەودایێ غارێ چشتاقە سواران نەیگەنێ *

دەبی سینگێ خۆمی لۆبکەمە دۆشەکەکی پەمۆی پەڕەکرای هەنگینێ جۆتە ماچەکی خەرات دەکەم یەکیان لە کلکەی برۆێ ئەویدیکەیان لە قۆرتێ گەردەنێ*

حەیران٥٥

کیژدەرێ ئەوە سەپانان دەچوونە گازێ لەبەری دروونەی بەوێ دانی هێـوارێ*

ئەمنیش تێلەکێش بووم مەرۆم هەردەگرتەوە کوڕەتیم حەیرانیش شەغرەی لێدەنا ئارەقەی ڕەش و شینمان لە بەدەنێ دەهاتە خوارێ*

خۆمن گەلە دەترسێم نەگەینە مرازو مەخسوودێ لە درێ خۆمان ببینەوە مارداری کارەکەی ڕەنج بە خەسارێ*

حەیران٥٦

بانەبۆران لە بەینی ئازیانەو گردەسۆری بانیەکی گەلە ناوداره*

دەمگۆ قەدیم و زەمان دەراوی شاقازی وئاقاری میرەکان و میرەکانی پر لە کارمامزەکانی سۆرغەری چاوکاره*

دەمگۆ کیژۆرە جوانی ئەوشۆ شای و گۆوەندە کەلەنەکی وەرگرە وەرە دەستم باریشی جەمەدانی تیکەرکەین لەگەر گورینگی هەوری و هیزاره*

حەیران ٥٧

حەیران لە گۆم و گـومان لە گۆمەشینیێ*

بەژنی حەیرانێ شترە نەمامە لەباغەکەی هیران و نازەنینیێ*

ئەوە پێشمەرگەمە لە خانەقین و جەلەولای هەتا دێمەوە حەیرانە جوانەکەم بەتاقی تەنێ لە کاولە خانیان بەجێدەمینێ*

حەیران٥٨

حەیران لە بیرەباتی سەرێ وخوارێ*

یار کارمامز بوو لە بناری زووری خشخشۆکێ زۆر بە هەشتاوی دەهاتەوە لۆ مـارێ*

دەمگۆ بەگزادە بینە ڕاتموسم لە تیشە تیش و پەنا ڕەوەزە شاخان ئەتوو نازانی جێژوان چەند خۆشە بەویێ بـوارێ*

* زووری خشخشۆکێ دەکەویتە باکوری ڕۆژئاوای بیرەبات.

حەیران٥٩

دەشتەکەی کەندیناوە و قەراجی گەلە بیناز دیارە*

دەچومەوە سەر زوورگەزراوی زەینێ خۆم دەدایێ چەندە جوان بوو لەپێش درێ من ئەو بنارە*

هەڵا هەڵا بەوێ بوارێ دەبریقاوە لەگەر کوریکە نیسان وحاجیلە و گۆرمزەی داخەکەم ئەوە سەری چەند سارە کەتتەوە دەستی ناحەزان و نەیارە *

حەیران٦٠

چەرت و گێسمەو تەلهەلالە هەرسێك لە ڕێـزێ *

حەیرانێ خۆم دەشوبهێنم بە خانزادێ سۆران ناوەڵا بە خاتوونە تەوریـزێ*

خۆزگەم بەوێ زەمانی وەکی ڕەشبەرەك دەگەڕا لە گوندی سەرو بنی دیار نەدەبوو ئەوجا حەیران لە کۆرانی تەنگ لۆم دەهاتە پارێزێ *

حەیران٦١

بناری قەرەچوغی لەمن گەری بە گەری و نوارە بە نوارە*

ئەوە حەیرانەکەی من دیتەوە لە کۆر و قەسارێ زێدە جوان لە ناو هەموویان تاقە و دیـارە ئەنگۆ وەکی من زەین و نەدایتێ هەردەرێی گەورە کیژێ سیانانە سوخمەی لەبەری سێ ڕێزە نەخشایە بە شەکرو پـارە*

حەیران٦٢

غاباتەکەی شەناغەی دایمە بە تووترك و زەنەکە*

ئەوە سەری چەند سارانە ئەو درە کەسادەی من شەیدای بەژنەکەی باریك و گەردەنی زەردوو دوو چاویی بەرەکە*

ئەوە چەند ڕۆژە نایەتە جێژوانەکەی لە جاراُن دونی لە گەروی بەرماران دەیگەیشتمی دەگۆ کچی دامەنشۆر چەندجاران گۆتم ئەتوو بەقسەی بەدکارانم قەد لەگەرمەکە*

حەیران٦٣

گازدەکەم دەرێم حەیراُن لە کەلەشخانی*

کیژ دەرێ پێمدەرێن پیر بووی دەمگۆ حەیران ئەتوو لەپێش درێ من هەر زێدە جوانی*

خوابکا بەس ئەتووم بدەنێ هەینێ دەچینە دەرێ لە وراتی دەبا کەس جێوڕێمان پێنەزانی*

حەیران٦٤

لە زووری شێخ سمایلی ئاورێ خۆم دەداوە کاولە شەعەلی*

ئەو حەسرزادە دەیگۆ لۆت دێمەجێڕاوگەی ژوانێ لەخۆشیان پێم هەردەزەلی*

دەمگۆ دەبی ئەوجارە وەها بیگرمە باوەش و هامیزی لۆخۆم بگرم شەمامە و بەندان بەتێروتەسەلی *

( گـــونـــــدی شـــــەنـــاغـــــه )

له سالّی (١٩٦٣) حەرەس قەومی فەرهود و تارانیانکرد و سوتاندیان،لەسالّی (١٩٧٥) دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول پێیان چۆلکردین بەزۆرو بەعەرەبکرا.

حەیران٦٥

بەویێ سبیانێ بە یادی جاران دەچوومەوە جێژوانەکەی لەپەنایـێ*

زمانی کۆڕینیم خۆم بـەبیردەهاتەوە لۆمەم مەکەن ئەگەر بڕیم دەکە سۆماییـم دایێ*

داخەکەی گرانم ئەمن ئەو کوڕەی جاران نەمایمە خۆ کەونە گراویەکەشم خرینگەی
بازن و گوارەو خرخارانی نایێ*

حەیران٦٦

حەیران لە چالووك و کەوڕەبەن وکەوری*

ئەوە چەند سارە دۆسـت و گراویێ خۆمی لۆ لەگەرە من دوودری*
دەجارەکێ لۆم وەرە جێڕاوگەو ژوانێ بتگرمە باوەشێ تێر بۆنکەم عەتۆتەو قەنەفرو
مۆری و مەرجانان هەتا کفتایی درم دەمری*

حەیران٦٧

ئەوڕۆکە نازانم لۆتان بەکێندەرێدا هەربڕیم گازدەکەم دەرێم بەئۆمەرەواوە وسێقوچان*

ئەوە لە شەنس و یەغباری من مارێ بابی حەیرانێ بارگەیان لێنا پەڕینەوە لەچەولنگا
پردێ بانیێ قەیباشی سوڕانەوە لە پێچاوپێچی پڕکانیان و مەلحەوالی ئەوجا لەکەرخی
چایەخانەی حەسۆی ئاوادەبوون لەقوچەکە سپیلکەی شۆردەبوونەوە لۆ کونەکەمتیاران
لەبەینی قەبری عەلی و شەناغەی هەواریان دێخست لە هەویێری مەجید پەری و
دەراویێ کاولان *

حەیرانەکەی من مامزە لەوان کارمامزەکانی توورندی مل بە قەرێتە لەگەر تەق و تۆقی
تفەنگچیان هەرەتە دەبوولە قۆپکە قۆپکی دڕکەوگابەرەکەی شۆردەبۆوە لۆ زووری
ناوبەندانێ بەسەردەکەت لەگومەتی شێخسمایلی ڕۆژی لێ ئاوادەبوو بەناچاری
لانێخۆی چادەکرد لە بەینی سەرگەڕان و سرێمان بەخشیان *

حەیران٦٨

ڕەزو باغی ئاکرێ بەبنە هەنارو هەنجیرە*

دەمگۆتە موختارو مەلاو ئیختیاری گوندی دەوەرن لۆم بکەن ڕاوو تەگبیـرە*

چەندی دەکەم حەیرانێ خۆم نادەنێ بەداخەوە گەلە لەمێژە لە مارە بابان وەردەو یەخسیـرە*

حەیران٦٩

دەوجا دەرێم ئەوە مانگ لەچاردەیە بەوێ عیشایێ *

چەند جوان دەداتەوە لەمنارەی مزگەفتان لە کۆشك وتاق و پەنجەران لەمنی ڕۆناك دەکردەوە حەوشەی مارێ بابی لەیلایـێ*

ئەوە سەرێ چـەند سارانە ئەمن کوشتەی ئەو زالم داکەیمە وەکی شێتەکانی دەل و دیوانە بێسەر دەگەڕێم لەوێ دنیایێ*

حەیران٧٠

لە سەر قەراتەکەی هەولێرێ زەینێ خۆم دەداوە شێخەڵاو باغی شاری*

داخەکەم ئەوشارە نازدارە بۆن خینی لێدەهات هەر کۆترەکان دیاربوون لەسەر لیس و بان و دیـواری*

خوا بکا ئەو دەردو بەرایەی کۆرۆنەمان لە کۆر بیتەوە دەبی شایی و گۆوەندەکی بگێرین زەردو کەسك و سۆر تێکەربن فیقەی زوڕناو نرکەی دۆرێ بگاتە ئەوسەری شـــاری*

★ ئەو حەیرانەم پاش نەمانی پەتای کۆرۆنا نووسیە.

حەیران٧١

گازدەکەم دەرێم وەی نایێ وەی نایێ *

دەنگێ گەورە کابان وخانەدانانی قۆناغی دەورێ بەرێ وەکی جاران لە گوێیی من نائێ *

خوادەزانی هەموو کوردستانم خۆش دەوێ توخوا لۆمەی درێ من مەکەن بە چدەمان وەکی هەولێرێ سەبرو سێبوریم پێنایێ*

حەیران٧٢

هەولێر ئەتوو شاری دۆست و ئاشنا وغەریبانـی*

لەگەر شارەکانی هەر چارپارچەی کوردســتان شان بە شان و جوانی*

خوایە دەنا هەر ئاوەدانبی هەتا دنیا مایە جارەکیتکە قەت نەیبینمەوە بە چۆلەوانی*

حەیران٧٣

هەولێر هەولێرە هـەولێر بە قەیسەری و دوکانە*

وەکی دەسورێمەوە لەدەورەی قەراتێ دەچمە باغی شارو گردکەندو شانەدەرو منارەی لەپێش درێ من گەلە درگرو جوانە*

خوایە شارە جوان ومێواندۆستەکەمان بپارێزی لە هەرچی پەتاو نەخـۆشی و باوو بۆران و تـۆفانە*

*ئەو حەیرانە بەدەنگی حەیرانبێژی لاو هێمن سارمەمی لەگەر بەستەی (مالی ئاوەدانم هەولێر) لە یوتوب بلاوکراوەتەوە.

حەیران٧٤

حەیران لە گەرارەو چـۆمان *

ئەوە سەرێ چەند سارانە ئەمن و توو بەتەمای یەکدینە کەتینەوە بنبارەکی لۆمان*

شنگو تاقەتمان لێبڕا ئەگەر ئەوسار هاوینێ ئەتووم نەدەنێ شەرتی پیاوان بی دەستتدەگرم لەڕکان دەچینە وراتی عەجەم و ڕۆمان*

حەیران٧٥

قەدیم و زەمان گۆتیتیان دەشتی قەراجێ دەشتەکی کاکی بەکاکی و ناوداره*

جێی کاران و کارغەزالان گۆمێ مارواشان خەندەکێ خەلیفەی ئاوێ بنبەردی بستێی سەرناجی شۆڕی لاکەچەی گۆمێ قورینگان ناوەلا گردەکەی باقرتەو کاولە ڕواره*

لۆخۆم دەچمەوە سەر کانییەکەی غەزەران جێی چاوڕەشان دوربینم دەدەمەوە بەرچاوان بزانم حەیرانە جوانەکەی من لەناویانرا دیـــاره*

حەیران٧٦

شێخ شـــەروان گوندی دەروێش عومەره*

گەورەو گچکەی ئەو گوندەی لە نەورۆزو شایی و گۆوەندان و کۆڕی حەیران گۆتنێ کراوو جەمەدانیان لەسەره*

ئەوە حەیرانەکەی مـــن لەگەر دەستەخوشکانی لەگەڕێ شایـێی هەردەپەڕی لەناو هەمووان ڕا دیارە چونکە تاقمەکی کوردی ئالای کوردستانی لەبەره*

حەیران٧٧

لە گە لی و گەلیان لە گەلی شەمان*

ئەوە حەیرانەکەی منە لەگەر دەستە خوشکانی دیتەوەلە کەنگرو کاردیان لە بەینی قەراسنج و زیارەتی لێی دەدان تاوەکی بارانی تەریدەکردەوە زولف و پەرچەمان*

دەمگۆتە حەیرانی ئەمن سوندەکم خواردیە بە شیخەکەی مار لە سندۆلان هەتا ئەتوو لەسەر دنیاییبی ئەمن هەرناگرم کەسەرو خەمان*

حەیران ٧٨

گەوارەکی دەهینا لە بنەی یەکـاویٚ*

دەیگرتەوە ئاقاری سـێوەکەو قەراتەسۆرانی بامەندان ئاوای دەکرد لۆ کەندێتاویٚ*

دەمگۆ ئەوەی باعیزیٚ دوودرانە خوایە شەوی لیٚ بگۆڕیٚ سەرانگریٚ بی سەراو سەر بکەویتە گێژەنە تیژەکەی خوار گراویٚ*

حەیران٧٩

حەیران لە شاویس وپیرزینی*

یار کارمامزە دەلەوەڕیٚ بەتاقی تەنیٚ لەسەر شارە مێروستانی لە بەینی سێبیران و ڕەشکینـی*

چەند خۆشە حەیرانیٚ بەدرێخۆت لەگەربی لەجێی ژوانیٚ سەبرۆکە سەبرۆکە لە باوشێی وەرینـی *

حەیران٨٠

حەیران لەبانان لەبانی سۆرکانێ*

بەژنێ باریکت شەنگەبی تەڕە لەچیوەو چیوان لە دۆری بالیسانێ*

ڕومەتت سێوی باغی شنۆیێ مەمکت شەمامەکانی چار بیستانی ئەدی نارێم
گەردەنێ زەردت لە دورڕا شەوقی دەداتەوە هەردەری ئەستیرەیە لە تاقی عاسمانی *

حەیران ٨١

دەشتەکەی قەراجێ گەلە پان و بەرینە*

دەمگۆ مارێ بابی حەیرانێ لەشەنس و یەغباری من ئەوە سەرێ سێ مانگانە
لەبنەگـەو بێرو هەوارینـە*

ئەوە کیژ دەیگۆ بەس بێمەوە لە هەواری لۆت دێمەوە جێڕاوگەو ژوانەکەی لەجاران
هەینێ بە کەیف ودرێ خۆت لۆ خۆت بم گەوزینە*

حەیران٨٢

دەمگـۆ بە دۆرو دۆران بـە دۆرێ هیرانێ*

حەیرانەکەی من کارمامز بوو دەلەوەڕا لەگەرێێ پاوانێ*

سەر لەسبەینان لەبەر خاترێ دری من کێشتاوێ خۆی داویتەوە سەرکانی و دەراوان
ئەدی نەمدەگۆ پارێزم لێدەستان لەسەر کانیێ شیلانێ*

حەیران۸۳

دەگەیشتمە حەیرانێ لە کەنگر و کاردیان لە بەینی شەناغە و دڕکەی*

دەمگۆ کچێ گەردەن کێل چ فایدەیە وەکی مردم هەنگینێ شین و ڕۆڕۆ و گریانم لۆ بکەی*

جارەکی خۆت نەدا جێڕاوگــە و ژوانێ هەتا ئەو درە کەسادەی من بەبۆنی عەتۆتە و قەنەفر و شەمامەکانی باغەرێ خۆشبکەی*

حەیران۸٤

حەیران حەیرانە حەیـران زێڕینە*

دەمگۆتە حەیرانێ ڕوومـەتی خڕوناسـکت هەر دەرێی ئەستوکە شانەی هەنگینە*

کیژێ بەگزادە هەمـوو سەر لەسبەینان لە خورێتی لەجیاتی پێخۆرو ناسکەنانی بە دیاری لۆ منیان بینە*

حەیران۸٥

ئەوڕۆکە بەوێ هیوارێ خەمەکی گەڵە گەورە سەرودری توند کردیمە*

لۆیێ ئەوها چاو بە گریان و لێو بە بارو غەمگینم دەرێی هێتیمم لەپەنا دیواران بێناز کەتیمــە*

لۆمەیێ دریمن مەکەن یادی کیمیابارانی هەڵەبجەو ئەنفالی گەرمیان و بارزانیان و شێخ وەسانان و بادینانم هاتەوە بیرێ سەرێ چەند ڕۆژانە هەنیسك و گریان بەرۆکیان گرتیمە *

حەیران ٨٦

گوێڕ گوێڕە*

بەژنی حەیرانەکەی من هەندە ڕێك و جوانە هەر دەمنی داری کنێـرە*

دەمگوتە ئەو بەژنباریکەی دەزانم ناتوانی بێیەوە جێڕاوگەو ژوانێ لەجاران جار جارە نامەکم بەدەست و خەتە جوانەکەی خۆت لۆ بنێـرە*

حەیران ٨٧

هەرجارەکی دێتەگوێم دەنگی شین و واوەیـلاو گریانێ*

ئەنفالە بەدناوەکەم دێتەوە بیرێ لە هەریرو قوشتەپەو گەرمیانێ*

ئای بابە دەردەکی گەلە گرانە دەردی لێکدابڕانێ هاوسەرو پشتشکان و جەرگ سووتانـێ*

★ لە ساڵی ١٩٨٣ڕژێمی بەعسی گۆڕ بەگۆڕ دوای ئەنفالە گەورەکەی گەرمیان کردی.

حەیران٨٨

کیژ دەرێ ئای لەخۆم غەریبێ ئەوەی شنگ و تاقەت بی لەبەدەنم نەمایە*

ناحەقم مەگـرن ئەمن جەرگ و در و هەناوم هەمووی تیکە تیکەو هەلا هەلایـە*

ئەوە سەریێ چەند سارانە سۆمای چاوم چوو هەرچی خوشك و براوخزم و کەسم هەبوو خۆ هەمووی ئەنفال کـرایـە*

حەیران٨٩

شێراوەو مەخشومە ئەوبەر ئەوبەرە*

حاوێ چۆمەزەردەرەو قەشقەو خورخورِی دایمە بە شەنگەبی تەرِە*

کیژ دەرێ کورەحەیران دەوەرە بچینە دەرێ لە کاولە وراتـی ئەوە سەریێ چەند سارانە بەتەمامە هەتا دریژگەم لەسەرە*

حەیران٩٠

تۆمەراوەو هەرسێ دۆرەزەی سیانان پشترِێ و بەر رِێتە*

ئەوە حەیرانەکەی منە لەناو دەستە خوشکانی لە چاووبرۆیان هەر دەمنی بازو شەهێنە*

دەمگۆتە ئەو ناوقەد باریکەی وەرە دەستەکم ببرِە بەس لۆ جێی ژوانێ دریژگەم مەشکێنە*

حەیران٩١

حەیران لە دالّداغانێ*

پەرچەمێ سۆری بەخەنە ت داو داو دابینە کەزیان جوان لوولدە و شۆرِکەوە کەرخی مۆری و مەرجانێ*

نازانم نە رِامووسان خۆشتـرە لۆمەم مەکەن ئەمن نەمدیتیە نەباوش و هامێزلێدانی کەونە یاران لە جێرِاوگەو ژوانێ*

حەیران٩٢

قەراتی دوین و قەسری خانزادێ هەردووك بەنــاوە*

دەراوێ شێخ توراب و بەستی شەرغە و بەردی سپی هەموو بواران هەردەرێی بووکی ڕازاوە*

دۆنێ ئێوارێ دەچومەوە سەرکانی و دەراوو سێبەر و نساران چاوم دەکەت بە جێژوانەکەی زەمانی زوو هەرچی کەونەبرین بوو هەمووم لێ هەروەشاوە*

حەیران٩٣

هەزار خۆزگەم بەزەمانی کوڕینی دەورێ بەرێ*

وەکی شەوێ دووسێ کیژو کار لۆم دەهاتنە جێی ژوانێ نەمدەزانی نە ماچکەم چەرخێ ڕوومەتێ نە بۆنکەم قۆرتێ گەردەنێ نەپانکەمەوە سێوەکانی بەندێ باغەرێ*

ئەلـحانەکە پیربوویــمە ئەوێ ڕۆژێم بەبیردێتەوە لۆیێ گەلە مەترسیان دەکەم بــمرم بەوێ خە موو دەردو کەسەرێ*

حەیران٩٤

حەیران لە سەربەشــاخی*

حەیرانەکەی من کارمامزە لە قەت تەلان  و شاخی*

حەیفم دەمینێ لۆ قەراج و کەندێناوە و شوان و شێخ بزێنی سەرێ چەند سارانە چۆلکراینە لەسەر درمان بوویتەوە کەسەرو داخی*

حەیران٩٥

لەدۆرو دۆران لە دۆرێ ئاکۆیـان*

ئەو بەژنباریك وچاوڕەشە چەندە جوانە ڕفت و ڕۆینی وەکی دێتەوە لەسەر کانیێ
لەگەر بایێ شەماری زولف وپەرچەمی سۆری بەخەنەی کەتتەوە سەر چاوو برۆیـان*

دممکۆ بەس ئەوجارە لۆم بێتەوە جێژوانێ دەبی تێر بۆنکەم خارێ گەردەنێ سەبرۆکە
سەبرۆکە دەرینم جۆتە لیمۆیـان*

حەیران٩٦

بەینی قەرغەتوو و کتکە و نەبیاوەی کانی دومەرانە*

لەوەتی حەیرانێ خۆم لێدابڕایە بەدەشتێ کەتیمە بوویـمە مەجنونەکەی دەل و
دێوانە*

خزمینمە قەت لۆمەی دریمن مەکەن بەخوای دەست لێکبەردانێ عەزیزو
خۆشەویستان دەردەکی گەلەگرانە*

حەیران٩٧

حەیران لە ئەسحابەلەك و یەدی قزلەری*

ئەتوو گەلە عەرێم گران و سەنگینی دەمنی کیژە بەگزادەو میرو بەگلەری*

ناوەلا لەپێش چاو و درێ من هەردەرێی کەوەکانی بناری قەرەچوغی لەسەر ڕەوەزە
شاخان بارێ خۆت شۆڕدەکەیەوە لە گەرێ سەنگەران و سەرێ بێژینگ بەسـەری*

حەیران٩٨

گەوارەکی دەهینا لەسەرێ زورگەزراوی*

هەور زگی لە عەردی دەنا دایدەدا تەزرەو بارانێ دمغرو دانی دەکوتا ڕەتیدەکرد لۆ سەر هێلەوەو سیـاوی*

مارێ حەیرانێ بنەگەچی بوون چاوی داکی کۆرەبی ئەوە جێ کۆزو هاوێری پێدەماری لێی تەڕدەبووەوە زولف و پەرچەمی خاوی*

حەیران٩٩

هـەولێر بەســەبرە باشتەپەو شـەناغە لۆ من مەفتەنە*

قەولە لۆم بێتەوە جێژاوکەو ژوانێ ناولەپ جوانەکەی سەرپەنجە بەخەنە*

ئەوجا دەست داوێمە سەرشان وپیلی لادەدەم کەزی و زولفان تێر بۆن دەکەم ڕومەت و گەرێ خەناوکەو گەردەنە*

حەیران١٠٠

دە مەڕۆ مەڕۆ دەبا بتگەمێ گەردەن کێل لە قەراسنجێ*

مارێ بابێ حەیرانێ دەچنەوە هەرێرو باتاسێ دەکەنەوە سمکەی بەراوە برنجێ*

بەژنێ حەیرانێ دەرێی شترە نەمامەکانی باغی شارەبانە وەکی ئەوەلی بەری تازە دەگرنەوە هەنارو نارنجێ*

★ سمکە: واتا چاندنی شترە برنج لەناو قوڕ و ئاوێ.

حەیران١٠١

حەیران لە دەو کۆدەرەو باخچەو ڕەزان*

عەلیاوە و ماستاوە هەر لە قەدیم و زەمانەوە مەشورن بە دەراوێ قــازان*

ئەوە حەیرانەکەی منە لەگەر کیژو کارێ دهێمات و خەزنەو تەرجانی دێتەوە لە کەنگرو کاردیان لادەدەنە سەر مەرقەدی شێخ جامی و شێخ شەڕوانی دەخوازن ڕازو مــرازان*

حەیران١٠٢

حەیران حەیرانە حەیران شەرمینە *

ڕوومەتی دەرێی بەفروخینە بەژنی داری چنارە پەرچەمی خاوە چاوی لەخۆڕا ڕەشن مەمکی شانەی هەنگوینە*

هەرچەندی گەڕام لەشارو گوندو هۆبەو ڕەشماران لەپێش چاوو درێمن چ جوان وخین شیرنی ئەوها لەسەر دنیایێ نینە*

حەیران١٠٣

حەیران وەرە پێم برێ ئەتوو لۆ ئەوها بەنازی*

لە ڕفت و ڕۆینت کەوو کۆتری لە گەردەن هەرکێشانێ قورینگی بۆنی خەنەی زولفات دەڕوا هەروەکی گورە مینــازی*

دەمگۆت ئەتوو ئەوەندە نازم لەسەر بکەی لۆ خۆم یارەکیتکە دەگرم ئەمان هەر چەندی دەکەم ئەو درە کەسادەی خۆمم لۆ نابی ڕازی*

حەیران١٠٤

خۆزگەم بە زەمانی شەوبــەکێوو شەوین و شیوەخواری*

وەکی بەخۆم شوان بووم حەیران شەنگەبێری بوو لەناو هۆبەو ڕەشــماران لەبەینی پرینگەو مێرخــوزاری*

حەیفە هەنووکەپیربوویــمە چاوم کزو ددان تاق و لۆق لەناو جێو بالینگانی شەوو ڕۆژبێنازکەتیمە لەماری*

حەیران١٠٥

حەیران لە گەرارەو چــۆمان*

داکی کۆرەبی هەندە شلکە پشتی دەچۆمێ لەبن کوندۆکەی ئاوێ وەکی دێتەوە لە دەراووکانی و گۆمان*

چبکەم بەو ئاخیر عومری عەشقی ئەو زالــم داکەی بوویــمە لۆیی دەترسێم بکەومەوە بن بارەکی تانە و تەشەنەو لۆمان*

حەیران١٠٦

ئەوە پێمدەرێن لۆ ئەوها بەدایم لێوبەباری و ڕەنگت زەردە*

دەمگۆ خەمێ لە درێمن سەرێ چەند سارانە هەمووی لەبەر لاسەنگی و ناتەبایی میللەتی کوردە*

داخەکەی گرانم هەموو عالەمێ دنیایێ دەورەت و ئالآی خۆیان هەیە سەریان پێکەوەنایە هەر ئەمە نەبی هیشکبووینــەوە لەناو کول و خەم و خەفەت و دەردە*

### حەیران۱۰۷

حەیران لە گەرمەسێرێ  ناوەڵا لە باشیك و بەعزانێ*

توخوا گەلی پێشمەرگان جارەکیتکە لولەی تفەنگان لەیەکدی مەکەن پشتی یێك بگرن دژی ناحەزان هەروونە سەرێ مەیدانێ*

خۆ سەرێ چەند سارانە گەلە زۆرمان قوڕ بە سەری و دەربەدەری و مارسوتان و کوشتن و بڕین دیتیــە دەبا نۆرەی خۆشی بی لە کوردستانێ*

### حەیران۱۰۸

دونێ سبیانێ بەتاقی تەنێ دانیشتبووم لە پەنا قاناتێ بیــرێ*

برینێ چەند سارەم لێدەهاتەوە سۆ وەکی جێژوانی خۆم و حەیرانێم دەهاتەوە بیــرێ*

دەمگۆ یارەبی خودای گەورە سەبەبکارو تێکدەری بەینی من و حەیرانێ شەل و گۆجە کەی سەر و ماریشی بە قوڕێ بگیــرێ*

### حەیران۱۰۹

لە دۆر و دۆراُن ناوەڵا لە شــیو و شیوان*

خۆزگەم بە زەمانی کوڕینی ڕۆژ هەتا ئێوارێ شوان بووم بە شەویش لە شەوبەکێوێ دەمانکرد ئەودیو ئەو دیــوان*

حەیفە ئەلحانەکە پیربوویــمە ئەوەی شنگ و تاقەت بی نەممایە کەسیش بەخۆم ناگری بێناز کەتیمە لە پەناو پەسیــوان*

★ شیو و شیوان : ئێمە لە هەولێرێ بە چێشت وخواردن دەڵێن (شیو) بەلام مەبەستی من لێرە شیو نیە بەڵکو نیمچە دۆرە واتە لزمایی یان شوێنی ئاوگرەوە*

حەیران١١٠

زورگەزراو باریك و درێژە قەرەچوغ برندو ڕك و عاسێیە*

بناری سەفینە شێتەی خۆشناوان قەدیم و زەمان بەدایمە ئاوو ڕەزو مێوو ترێیە*

ئەنگۆ نازانن ماچی گەورە کیژان تامەزرۆ شکێنە لۆ گەنج ولاوان تام و لەزەتی هەردەڕێی هەنجیری ئاکرێیە*

حەیران١١١

شێخ شەروان گوندەکی گەلە ناوداره*

حەیرانەکەی من وەکی بەردیلەکانی بەدامەن و بەرۆکی دوایێ مێگەلانی کەڕەی کەویسارە *

حەیفم دەمینێ ئەوە سەرێ چەند سارانە وەردەو یەخسیرە بە دەستی گولەکەی سەگباب بوویتەوە خەسارە*

حەیران١١٢

جادەکەی پیروسان ڕك و بەپێچاو پێچە*

مارێ حەیرانەکەی من حەوشەیان تانۆکە دیوارو خانیان بە قسرو گێچە*

کیژ دەرێ بەخوای تازە ئەمنت بەخۆشی نادەنێ لاوێ ناو لاوان یان دەستم لێهەڵگرە یان بە زەبری لوولەی دەمانچەی هەر کووتە سەر مارێمە باب و برام ڕاپێچە*

حەیران١١٣

حەیران لە بەلەبان و بەردبڕی ناوەڵا لە بانە قەراتــێ*

بەینی من وحەیرانێ بوویتەوە عەشقەکەی پەرێ و برایــمی مەڵازێتدینان کەتتەوە ڕێیەکەی هات و نەهاتــێ*

گملە مەترسیاندەکەم وەکی دەڕۆیشەکانی خروەکێش ڕۆژەکێ سەربنێمەوە لەچۆل و دمشتان هاوارتە لەخۆم کەسیشم بە هاوار نەگاتێ*

حەیران١١٤

هەزارخۆزگەم بە جارێ لە جاران*

وەکی کیژو کارێ شەناغــەی تاقم تاقم دەڕۆیشتن لە ڕێی داران*

ئەوجا حەیرانێ خۆم دادەبڕی لە سێبەرو نساران تێر تێر بۆنــم دەکرد شەمامەو خاران*

حەیران١١٥

دوا سنووری کوردانە داوگەمیل و سێوەکە*

حەیفم دممینێ لۆ ئەوان جوانکە وجاحێرەکانی تازە دادەنێن خەتێ ســمێری لەگەر ناسکە کیژۆرەکانی بەتەمانە خڕکەنەوە بنیێ مەمکە*

چاوی داکی کۆرەبی زمانی بشکێ ئەوڕۆ لۆ گەردەنە زەردو جوانەکەی خۆی دانیشتیە و فرمێسکان بەردەداتەوەو دەرێ سەردوولکە*

★ ئوحەیرانە لۆسەر زاری دایکێکە کۆرپەکەی جوانە مەرگ بوبێ و ئەو لۆی بگرێی .

حەیران١١٦

ئەوە سەرێ چەند سارانە لەحەژمەتی حەیرانێ در پڕ لە ناسۆرو برینم*

خۆمن نە ڕۆستەمی مازەندەران بووم نەحاکمەکەی زەمانی هەتا بەزۆرو زۆرداری لە پیرەبابەکەی بستینم*

دەمگۆ خوایە گیان لە دنیایێ نەیانهێشت لۆ یەك ببین ئەتوو وابکەی لە بەهەشتێ پێشی هەموو کەسەکی هامێز لە حەیرانە گچکەلانە کەی خۆم وەرینم*

حەیران ١١٧

ئەوە خەمێ حیزە دنیایێ هات و لە درێ من تێکدەچــڕژێتن*

کیژ دەیگۆتە پلکە پێناوێ لۆم برێ لاوێ ڕەشتارە ئەمنی نادەنێ بابەس ئەوەندە بە بەژن و بارایێ مندا هەربرێتن*

دەمگۆتەپێناوێ مادام بەخۆی ڕازیبی دەستی لێ هەرناگرم قەیدیناکە با خینم لەسەرە وی بڕژێتن*

حەیران١١٨

دیسان غەمەکی گەلە گەورە بەیادو بیرمدا هاتەوە*

یا ڕەبی خودایە دەنا تەفرو تونایانکەی کۆرایــی لە چاوانیان بکەویتەوە*

ئەوەی بەسەر ژن و منداری گەرمیان و بارزانییەکاندا هات زۆر خراپتر بەسەرخۆیان و مارو منداریاندا بێتەوە*

★ بە یادی ئەنفال و زیندە بە چاڵ و کوشتن و بڕین و نەهامەتیەکانی میللەتی کورد.

حەیران١١٩

حەیران بەداران بە داری سۆرگـوری*

کیژۆرە جوان دەری لاوی ڕەشتارە ئەوە سەری چەند ڕۆژانە نازانم لۆ ئەوها دریمن دیت و دەقـرقـری *

دەورە دەستی من بگرە دەرمبینە لەناو خەم و خەفەت و تاریان سەری خۆمان هەرگرین بپەڕینەوە لە ئاوی قەندیلی بچینەوە وراتی ناوکوڕی*

حەیران١٢٠

گاس دەکەم دەریم ئای دنیایی بێوەفایـی*

خواپێی ناخۆش نەبی پاشی دوو چاوی بەرەك سەبرو سێبوریم بەقەت کەسۆکە نایـی*

قەدیم و زەمان گۆتیتیان مردن کاری خودایەو هەر هەبووە ئەمان خۆزی بەخۆزیداران دەردە پیری نەبوایـی*

حەیران١٢١

بەحرکە لەمن بە سۆرە قورینگی دامەن بەخوناوە*

ئەوە زەردو سۆر تێکەر بووینە لەسەرکانیی بەحرکەی لۆ کەنگـرو کاردیان دەکەن براوە *

حەیرانەکەی من لە دوور ڕا دیارە چونکە بەژنی لە هەموان درێژترە بسك و کەزیانی کەتتەوە سەرشان و ملی هەر دەریی ئاوریشمی خاوە*

حەیران١٢٢

شاوێس وپیـرزین ئەو بـەر ئەو بەرە*

ڕەوەکێ قازو قورینگان دەهاتنە خوارێ لەسەرێ تارینی بەسەر کۆڕەك و کۆڕەکی دەیانگرتەوە شەوەك و مەلا ئۆمەرە*

ئەوە شاییەك دەگەڕێ لەسەر گردی ئەمنیش بێ دۆمە لەناو کوڕان دەمگۆ دەبی خوا بکا دری نەرمبی بێتە دەستم ئەو بەژن باریك و ڕە ش ئەسمەرە*

حەیران١٢٣

گەزوەشان و گڕاو لە دەو ڕووبـارێ*

دیسان خێر وخێرەسـاتی عارەبان لە کلکەی شەیتان قەرایێ بەرەو گردی کەندێتاوەی هاتنە خوارێ*

دەمگۆ هەرچی ئەوجارە بووە باعیزی چۆلکردنی قەراج و کەندێتاوەی خوایە دەنا دەردە کۆرۆنەی بگریتن بەپەلە کڕوزەش نەگاتە مـارێ*

حەیران١٢٤

دەشتەکەی هەولێری هەموو هاوینان بە تۆزو غوبارو گەردە*

دۆست و برادەر پێمدەرێـن لۆ ئەوها بەدایم لێوت بەبارەو ڕەنگـت زەردە*

دەمگۆ ئەنگۆ نازانن ڕەنگ زەردیی من هەمووی لەحەژمەتێ بەژنێ باریك و دووچاوێ بەرەکە دەرێ لاوە یان وەرە بمخوازە یان دەستەم لـێبەردە*

حەیران١٢٥

حەیران لە مەرگەو پشدەرێ*

بەبیرت نایێ هەموو سەرلەسبەینان لۆم دەهاتیە جێراوگەو ژوانێ دەمکردەوە کلیلێ سنجاقان سەبرۆکە سەبرۆکە دەرمدەهینا سێوەکانی بەندێ باغـەرێ*

غەمێ ئەو غەدارداکەی لەدرێمن گەلە زۆرن مەترسیان دەکەم ڕۆژەکێ بمرم بەوێ تاخە هەر لەگەر کەسەرێ *

حەیران١٣٦

دوو گوند گەلە خۆشن لە دەشتی شەمامکێ*

یەکیان گردعازەبانە ئەویدیکەیان عەویتەیە لە بەڕاکێ*

کیژۆرە جوان دەیکۆ لاوێ ڕەشتارە ئەگەر ڕۆژێ جارەکێ سەر و توالێت و بەروپژدیتت نەبینم لە زەویێ بەرماران چبکەم هەرچەندی دەکەم کفتایی درم ناشکێ *

حەیران١٢٧

لەحاوی و حاویان لە دەو حاویێ گڕاوێ*

بەژنت تولە نەمامە ڕومـەتت سێوی لاسۆرە وەکی گەردەنت هەردەکێشی هەر دەرێی سۆرە قورینگی غەدارداك لە زاڕ دەراوێ*

خۆزگەم بەو دەورو زەمانی وەکی حەیران لۆم دەهاتە ژوانێ لەبەینی سەرسەدەو قاتاتی بیرێ دەمانکردەوە شـەوڕاوێ*

حەیران١٢٨

هەرەتی سابراغ و میـرزاغەی بە کەنگرو کاردیە *

کیژۆرە جوان جواب لەسەر جوابان دەنێری دەرێ زانیتم جۆتەکێ یارانت  بەسەرە مندا گرتیە*

دەمگۆ بەگزادە باش بزانـە ئەتوو لەپێش چاو و درێمن زێدە جوانی ئەوە بەدکارێ بەینی من و تووە ئەو بوختانەیان بممە کردیە*

حەیران١٢٩

لە بان و بانیان لە بانیێ ڕەشکینی*

حەیرانە کەی من کارمامزەکی سۆری سۆرغە رە بەوێ پایزێ دەگەڕێ لە گەرمە لانێ لە بنەبنەی تارینی*

هەرچە ندی نیشانی دەگرمێ بە تفەنگەکەی قۆنداغ بەگرێ نازانم نەلەبەختێ منە

نە لە تالحێ حەیرانێیە یان ئەوەتە سەردەکا یان کورتی دەهینی*

حەیران١٣٠

کیژدەرێ لەخۆم بێکەسێ وای لەخۆم وەردەو یەخسیـرێ *

یالا یالام بوو لە پرتەو بۆرەی گولەکەی  مێردان قوتاربـم ئەو جارە خراپتر کەتیمەوە زنجیـرێ*

حەیرانەکەی خۆم دەشوبهینم بەوان کارمامزەکانی بناری چیایەکەی شیرینێ ئەوەندە توروندی و سرکە بەخۆم نەیی بەکەس ناگیـرێ*

حەیران ۱۳۱

دیسان غەمێ دنیایێ هاتو لە دریمن دەکاتن هەلایە*

ئەوە چەند ڕۆژەکە زانیتم کەونە گراویە جوانەکەی من بە شوودرایە*

بەخوای لەوێ ڕۆژێوە ئەوی شنگ و تاقەت و زەوقبی لە درێ کاکێنگۆ نەمایە*

حەیران ۱۳۲

بناری دیدەوانی بەبنە گولەك و گۆرمـزە*

سەرم لەخۆم سوڕمایە ئـەو غەدار داکە سەرێ چەند ڕۆژانە لەبەر چ لە من درگرو عاجـزە*

ئەوە حەیرانەکەی من دەڕوا لۆ کۆرو قەسارێ لە بەرایی سەرەژنان پێی هەردەینی شەقاوان داوێ هەر دەڕێی کارمامـزە*

حەیران ۱۳۳

قەدیم و زەمان عاڵلا لەمن بەکۆل و بیـرە*

ئەوە کەونە گراویەکەی منە وەکی دیتەوە لەسەر بیرەکەی حاجی ڕەحمان گەرازی خۆی دەشلێنی هەر دەڕێی کیژە بەگزادەو میـرە *

دەوری خۆی وەکی شایی بەردەدرا دەهاتەوە لە کۆرانی تەنگ هەر دەتگۆت قورینگە بەخۆم نەبووایە بەخوای بە کەس نەدەگیـرا*

حەیران١٣٤

حەیران دووری گـەڵە لـەمن دووری*

خۆزگەم بەوێ دەورو زەمانی کا وەکی گۆپارم هەردەینا هەربەخۆم میر کوڕ بووم لە دیوانێ دووووسێ دەکەتنە بەرپێم دەیانگۆت دەبی لە قسوریمان ببـووری*

داخەکەی گرانم ئـەوە پـاشی توو بێناز کەتیمـە لە مارێ لەبەینی کوڕو بووکان گەلە بە نـاگزوری*

حەیران١٣٥

دۆری گرتك و ڕۆستێ لە مـن بە ڕەز و باغ وکانینە*

دەبڕۆلنە باخچەی ناومـاران چەندە بێ ڕەونەقە چونکە حەیرانەکەی من لە ناودا نینە*

لەوێ ڕۆژێوە حەیرانـــێ خۆم لێ دابڕایـە هەر وا دەزانم لەبن دارەکیمە چشتاقە پەلکی پێوە نینە*

حەیران١٣٦

ئەوڕۆکە درێ من گەلە بەکول وخەمـە*

حەیرانەکەی خۆم دەچوێـنم بە کەوەکانی قەرەچوغی وەکی هەموو سەر لەسبەینان دەخینن دەم دەمـە*

خۆمن هەر ڕۆژەکی حەیـرانە جوانەکەی خۆم نەبینم لە کۆشك و تاق وپەنجەران وا دەزانم سارەکی تەواو لە عومرم کەمە*

### حەیران ١٣٧

هەموو بواران لەبناری چیایەکەی خارخاران شین دەبن کوریکە حاجیلە ومێلاقە *

حەیف و مخابنم دەمینێ لۆ شەهیدانی کوردو کوردستانێ ئەورۆکە لەمە بووینە فیراقــە*

خۆ ئەمن دەست لە بستەکی خاکی کوردستان هەرناگرم مەگەر لە سەر قەراتەکەی کەرکوکێ بەرامبەر شۆریجەو ڕەحیماوەی بکرێم فەلاقە*

### حەیران ١٣٨

بە بناری شیرینێ داکەتـم لەمن بــە مامـز و کارە*

ڕمزێ ناو ماران لەپێش چاوی من هــەندەیتکە جوان و ڕەنگینتـر بووە چونکە لەناوە ئەو چــاوڕەش و شــەدە لارە*

هەر چەندی حەول و تەقەلامداحەیرانێ بەدرێ خۆمیان نەدامێ هەتا ئەو ڕۆژەی سەردەنێمەوە ژیانم تــارە *

### حەیران ١٣٩

حەیران لەبەر حوشتــری*

سەبرەکم لێ بگرە هەتا ئەوجارە دێومرە دێتەوە گوندی دەبی لۆتبکرم خەناوکەی جوانی پڕلە مۆری و مەرجان و قەنەفــری*

دەوجا ڕۆژی شاییان لە ملی خۆتکە بێتە خوارێ لەبەینی سوخمەو کراسەکەی سۆری مەڵەسکتانی گورگــوری*

حەیران١٤٠

گازدەکەم دەریم لە سابراغ و میان دواوێ*

حەیرانەکەی من مامـزە لەدەشتی شار ویرانێ دەلەوەڕێ لەناو گیابەندوخـاوی*

شەرتم کردیە لەپاشی دووچاوێ ڕەشی ئەوێ قورینگ و گۆزەرەی لەدنیایێ تازە قەت کەسم نـاوێ*

حەیران١٤١

حەیران لە بانیێ قەرغـەتووی زەینێ خۆم دەداوە سە دەکەی کونە کۆتـری*

غەداردالێ خۆ ئەتوو سەریێ چەند سارانە دۆست و گراویێ خۆمی لۆ بەینەکە لەگەرە من دوودری*

دەیگۆ لاوێ ڕەشتارە ئەلحانیش لای تووم هەر بەتارە ناهەقم مەگرە ئەدی نەتزانیە دەرێن لۆمەی عەبدان گەلە گرانترە لە عەزابی قەبـری*

★ کونە کۆتر بەریەستەکی گەورەیە لەسەر زێی گچکە لەبەینی قەیباشی و دوبزیە*

حەیران١٤٢

حەیران لە مێرگـەسـەرێ*

کیژ دەرێ هەی لەخۆم سـەربەتارو قۆڕبەسـەرێ*

ئەوە سەریێ چەند سارانە مایـمەوە بە گەورە کیژی دەریێ گریێ بەختم بەسترایە هەرچەندی داخوازیم دیتن قسمەتم هەرناستی لۆخـۆم لەو بەندەی بچمەدەرێ*

حەیران١٤٣

ئاژگەو ئەرمەوان بەبنە هـەنارو کرۆسکە هەرمیـنە*

کیژ جوابان دەنێری دەرێ لۆم برێنە حەیرانێ لۆ چ دەنگ و سەداو خەبەری نینە*

ئەدی نازانی جۆتە شەمامانم دەرێی خۆخی بە کورکن سەرێ چەند سارانە لۆ درێ
ویم بە دەق و نوشت لە مارە بابان هەرگرتینە*

حەیران١٤٤

حەیران لە گەڕەسـۆری*

حەیرانەکەی من کامامزە لەدەشتی کاولە قەراجی هەموو ئێواران لانێ خۆی چادەکا
لەبەینی تەپەو لاسۆری*

گەلە خۆشە گەورە کیژ لۆت بێتە ژوانێ جاربەجار ماچکەی چەرخێ ڕومەتی بۆنکەی
گەردەن و بن شۆڕابەی گوارێ نۆری بـە نـۆری*

حەیران١٤٥

حەیران لە باغان لە باغی سەیدەمینی *

دەردی دووری ولێکدابڕانێ گەلە ناخۆشە خوایە دەنا قەت کەسۆکە نەیبینی*

کیژ دەرێ دەزانم ئـەمـنت بەخۆشی نادەنێ لۆنائێ دەستم بگری بچینە وراتی کۆێێ
لەو زەلیلی و بەندەم بە یەکجاری دەرینی*

حەیران۱٥۲

کیژێ حەیران ئەتوو لەڕفت  و ڕۆینت هەردەرێی کیژە میری بابان و بادینان و سۆرانی*

کیژ دەیگۆ بەخوای کوڕەلاوەدەنا ئەتووش لەپێش چاوو دریمن هەر دەرێی کوڕە پاشا و سوڵتانی*

کوڕ دەیگۆ زانیتم داخوازیکەرت گەلە زۆرن چونکە دایکەکەت حەسرزادەیە لۆێ ئەوها بە وەفای لە ڕاستە من بەهەمووان ناڕازی و سەرگرانی*

حەیران۱٥۳

ئۆمەرگومەت و سێگرتکان بـە ڕەزو باغـن*

کراسی حەیرانێ مەلەسکتانە سوخـمەی کۆییانی حەمایلۆك پێوە سێ ڕێز داغ داغـن*

خۆئەمن دەست لەسەر دوو چاوێ بـەرەك و گەردەنێ زەردی بەخار هەر ناگرم ئەگەر لە پەت و قەنارەم بدەن ئەو براگەورانەی ساحێب قۆناغن *

حەیران ۱٥٤

حەیران لە داربەســەرو دار بەسەری*

زەمانەکێ دەتگۆ بازە مەدەمە لەسەر کەپکەشاخ و گرد و دۆران دەگەڕام لە ڕاوێ گەری بەگــەری*

داخەکەم ئەلحانەکە دەستم لەرزۆکەو چاوم کەم بینا بووینە ئێرەو بێرێهێ دەڕۆم شنگ و تاقەتم نامینێ بڕۆم  ئەوبەر ئەوبەری*

حەیران١٥٥

حەیران ئەتوو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر لە گڕ و لەجۆشی*

لەسەرو پەرچەمی زەردو وچاوی شینت خانەخراپ هەردەمنی کیژەکەی کافرۆشی*

هەرچەندی کردم ئەتوویان بەحەراری نەدامیێ ئەمنیش ئەوە تەرکی دنیاداری دەکەم هەروەکی زەمبیل فرۆشی*

حەیران١٥٦

وەی نایێ وەی نایێ*

چەندی هەست ڕادەگرم لەڕەزوباغیێ ناو ماران لە شایی و گۆەند و سەیرانیێ دەنگ و سەدایێ حەیرانە جوانەکەی منی لێ نایێ*

لۆیێ هەر چەندی دەکەم و سەر دەینم و دەبەم سەبر و سێبوریم دری من نمایە لەسەر ئەویێ دنیاییێ*

حەیران١٥٧

حەیران لە شێخ وەسانان و بالیسانیێ*

ئاگرەك بەربوویتە جەرگ و هەناوم بەوی سۆرە سبیانیێ*

دیسان یادی ئەنفال و کیمیابارانە حەیفم دەمینیێ لۆ پیرو جەوان و منداری ساوا دەیانگرتن دەیانبردنە کوت و عمارەو نوگرە سەلمانیێ*

حەیران١٥٨

حەیران لە داران بەخۆم لە ڕاوێ*

یارم کارمامزەکی سمخڕە هەموو پاش عەسران دەچتە سەرگۆمەکەی شیرنـاوێ*

چەندە بەنازو عینوان دەڕوا لە بەینی دەستەخوشکان وەکی خۆی بادەداو شەقاوان داوێ *

حەیران١٥٩

حەیران لە شنۆ سابراغ و سەردەشتێ*

ڕومەتی ئەو بەرەکچاوەی لە دوور ڕا بریقەی دێ هەر دەڕێی مانگی چاردەیە لەناو ئەستێران دەدرەوشێ*

ئەمن موبتەلا بوویمە بەچاوی کەژاڵێ بە ڕۆینی حەلیمێ بە چاوو برۆی فاتمێ بە زولف وپەرچەمی خاتونێ ناوەڵا بە بەژن و بارایێ بـنەوشـێ*

★ دوابەندی ئەوحەیرانە زیاترلە ( ٥ )حەیرانبێژ گۆتیتیان هەریەکە بە دانان و حەزی خۆی .

حەیران١٦٠

دۆڕێ ئالانەی بە دارگیـزو چنارو بـەڕووە*

بەژنی حەیرانێ دارئەسپینداره چەندە ڕێك و جوان لە دەراوو چەمان هەرچـووە*

کیژدەرێ لاوە ئەتوو کەینێ دێیەوە لە وراتێ غەریب و غوربەتان لۆخۆت بمخوازی ئەوە بێناز کەتیمە لەمارە برایان هەمووجەرگ و هەناوم تیکە تیکەو ڕەش بووە*

حەیران ١٦١

لەبەینی کەندارو گاوەرەی زەینێ خۆم دەداوە زار بازاڕگەی*

حەیرانەکەی من کێروشکەکی چاو لە خەوبوو لەناو قۆپەنە جۆی لەبەینی کاریتان و دیبەگەی*

دەمگۆ کچێ دامەنشۆڕ ئەتوو چەند سارە لەگەرە منی زانیتم دەرێن درت گەردی گرتیە توخوا بە قسەی بەدکارانم قەت لەگـەر نەکەی*

حەیران١٦٢

ئەوڕۆکە درێ من گەلە بەتاو دەکاتن تەخمینێ *

دوونێ هێوارێ لە سیلەی باغەکەی گردکەندی دەگەیمە حەیرانێ دەیگۆ لاوە چەند ڕۆژە نەمدیتی لۆ ئەوهالە بێ ڕەنگ و ڕووی ڕەبی عەمرم نەمینێ*

دەمگۆ بەگزادە خەمان هەرمەگرە خەمێ لە درێمن گەلە زۆرن خەمی تووش سەر بارە ئەتوو نازانێ کۆمەرەکێ پێشمەرگان ئەوڕۆکە لە بناری قەرەچوغی کەتینە کەمینێ*

حەیران١٦٣

زەویێ بەرماران قەرسیل بە جۆیە*

گوارەی حەیرانێ عەیار بیست وچاری بە کاریتەی پێنج گۆیە*

بەژن و بارای حەیرانێ نە کورتە نە درێژە ژیکەلەیە چاوو برۆی گەلە ڕەش و جوانن قەدیم و زەمانیش دەرێن شەرتی جوانی ژن هەرچاوو برۆیە*

حەیران١٦٤

کیژدەرێ خۆزگەم بەوێ دەورو زەمانیکا وەکی لە کەنگرو کاردیان بووم لە بناری زوورگـەزراوی *

خۆم دادەبڕی لە کۆمەرێ دەستە خوشکان بەتاقی تەنێ زەینێ خۆم دەداوە ئاقاری هێلەوەو سیـاوی*

کوڕە لاوکێ منیش بەهەنجەتی ڕاوێ سوار دەبوو لە جوانەماینەکەی کەلەکەویتە لۆ جێیێ ژوانێ سەرو سواری چەندە جوان بوو وەکی بەرامپیلم دادەنا بەخۆم ڕستێ جەرەوێـم لێ وەردەگرت بەناولەپـەکی سۆری خەنـاوی*

حەیران١٦٥

ڕاوچیان ڕاوە ڕاوەتیان لە بەینی بەحرکەو پیرزیـنی*

کارمامزەکیان دادەبڕی لە داکی ماری وێرانم وا قۆنگران دەکا لەپێش ڕستێ تاژیان هەنیسکان دینی*

دەمکۆ دەردێ لێکدابڕانێ دەردەکی گرانە ئەوەی بەخـۆی نەدیتبی نازانی خوایە دەنا قەت کەسۆکە نەیبینی*

حەیران١٦٦

حەیران چەندم پێدا هەرگۆتی لەجـمکەو بنبێـرزی *

ئەتوو وەکی سواران هەردەگریەوە لەدوو سەپانان خۆت هەردەشەقێنی هەر دەرێی کارمامـزی*

سەبرەکم لێبگرە خوا دەکا ئەو سارەکە ئەو دەردو پەتایە نەمینێ دەبی کەپرەکت لۆبکەم لە دۆرێ خانەقایێ بەرامبەر پردەکەی حافیـزی*

حەیران١٦٧

برادەر ئەوە هێرشێ دوژمن و نەیارانە*

هەستەوە دەست و بردەکی بـکە ڕەخت  و خەریتان ببەستە ئەوڕۆکە دیارە ڕۆژ ڕۆژی مێرانــە*

ئەوە دەچمە کەمینێ توخوا ئەگەر نەمدیتیەوە وەسیەتبی لەسەر گۆڕەکەم بنووسە ڕوحت  شادبی هیواو ئاواتەکەت هاتەدی شەهید بووی لەسەرخاکێ کوردستانـە*

حەیران١٦٨

حــەیران لە ئۆمــەرگومەتی*

ئەو غەدارداکە ئەمنی کوشتیە بە هوردە خارە ڕەشەکەی سەر ڕومەتــی*

گەلەکم حەز لێـە بنێرمــە داخوازی حەیرانێ چبکەمێ هەرچەندی پێم تەواو ناکرێ نەختە هەر لەگەر قیمەتــی*

حەیران١٦٩

لە باغان لە ڕەز و باغەکەی سەمــەر قەندی*

کەپرەکی لۆ حەیرانێ  دەکەم لەسەر ئاوی پیرە بێخارێ بەرامبەر گەری خەرەندی*

ئەوجا بە شایێ دۆستان بە کۆرایێ دوژمنان دەستی حەیرانێ خۆم دەگرم لۆ ناو ئەوێ کەپرو شانە شینێ هەر بە زاوابەندی*

حەیران ١٧٠

دەمەڕۆ مەڕۆ با بتگەمێ هۆ هۆ کیژۆرە خڕێ*

ڕەبی تاعونەك بێتن ئەتووی لێدەرچی مارە بابەکەت دواییان لەمارێ بڕێ*

چونکە چەندی کردم ئەتوویان بەخۆشی نەدامێ دەوەرە دەستێ یەك بگرین بچنەوە دەشتەکەی ناوکوڕێ*

حەیران ١٧١

گازدەکەم دەرێم شێراوە گوندەکی بەڕێو جێیە *

لۆیێ سێبوری درم پێدێ چونکە کاکە شێخ نەجات لەوێیە *

پیاوەکی گەلە گران و سەنگین و خانەدان و عەرێمگرانە لۆیێ متمانەم پێیە *

حەیران ١٧٢

گەلی برادەران زەینێ خۆتان بدەنێ ئەوی داوی ڕەش بی لەسەرو ڕدێتم نەمایە*

داخەکەی لە درێمن پیری سەری لێدایمە لەتاو دەردان ئاگام لە عەمری دنیایێ نەمایە*

خۆزگەم بەوێ دەورو زەمانـیکا وەکی بەتاقی تەنێ مەڕم ڕادەدا لۆ شەوین و شیوەخوارێ نەمدەزانی نە بارانەو نەبایە*

حەیران۱۷۳

دەمگۆتە حەیرانێ  بەس ئەوەندە هەربگرە خەمان*

ئەوجارە بچمەوە شارەکەی هەولێرێ بە کەیفی خۆم دەگەڕێم لەناو قەیسەری و دوکانان*

دەبی لۆت بینم ڕەشکەو شمری و سۆتکەو قەنەفرو  ڕەشەڕەیحان و گوران عەتۆتەکی دروستکە بدە لە سوخمەی بەشایێ دۆستان بە کۆرایێ دوژمنان*

حەیران۱۷٤

ئەوە چەند ڕۆژە سەبرو ئارامم لێ هەرگیرایە*

نەمدەزانی قەمتەرەی مارێ بابی حەیرانێ لۆ ئەوها تۆپ و کلیل درایە*

لە دەرو جیرانانـم دەپرسی دەیانگۆ چووینە دەرێ لەشاری لەبەر کۆرۆنەی لێم مەگرن ئەو گەڕەکە لۆمن هەر دەتگۆت ئاشی ئاو لێبڕایە*

حەیران۱۷٥

حەیران لە ماوەرانێ*

چەند جارم پێگۆتی لەجێێ ژوانێ*

خەمان هەرمەگرە بەس خوابکا ئەو دەرد وبەراو نەخۆشیە نەمینێ دەبی سێ شەوو سێ ڕۆژان لۆت بگێڕم شایی و دیلانێ*

## حەیران ١٧٦

کیژ دەیگۆ کورە حەیران ئەوە چەند سارە ئەمنووتوو بەتەمای یەکدینە*

ئەو پیرەبابەم ئەمنت ناداتی هەربەخۆم دەزانم بەتەمای چیە ئەو بێڕەحم و بیدینە*

لەبەر تەماحی خۆی و ماڕێ دنیایێ سەربەهەویم دەدا چبکەم بەخوای چ دەسەراتم نینە*

- ئەو حەیرانە کۆمەلایەتیە .

## حەیران ١٧٧

دەمگۆتە دریخۆم ئەتو لۆ ئەوها مەلول و کەسادی*

دەیگۆ ئەتونازانی لێکدابڕانێ عەزیزو خۆشەویستان دەردەکی چەندە دژوارە بەبێ مـورادی*

حەیفم دەمینی لۆ کاکە حەکیم مەزنی گەلە بەغەریبی و بێکەسی سەرێ خۆی ناوە لە شارەکەی ڕومـادی*

★ ئەو حەیرانوم وەکو وەفایەکە لۆ وێنەگری جوانە مەرگ (لوقمان مە زن)ە لە غەریبیان.

## حەیران ١٧٨

خەبەرەکیان دەدامێ ئاگـری لە جەرگ و هەناوم کردەوە*

هەورەکی گەلە ڕەشی تـــاری شارەکەی هەولێرێی لەمن گرتـەوە*

گەلە پیاوی ماقول وگەنج وجوانی بەجوانەمەرگی بەڕۆژی جێژنەی قوربانێ لێمان بـردەوە*

★ بەیادی تەقینەوەی یـــەکی شوباتی شاری هەولێر*

حەیران ۱۷۹

نازەنین خۆشـە لە بنەی سەفینی*

کیژ دەرێ کورە حەیران کەینێکە دەنێریە داخوازیم بە حەرارى لۆخۆتـم بینی*

ئەوجاپێکەوە سواردەبین دوو بە دوو لە دۆجەکی مەکینە خوار دەچینە ناو ڕەزو باغی شەقراوەی لۆمانگێ هەنگینی*

★ دۆجی مەکینە خوار : جۆرە قەمەرەیەکی بەناو بوو هەتا سالی حەفتایەکان مابوو.

حەیران ۱۸۰

حەیران لەدینگاوەو تەلەمەتـاری*

بەوێ هێوارێ خەبەرەکیان دەدامێ دەیانگۆ داکە نازدارەکەت گەلە شرە بردیانە نەخۆشخانەی ڕزگـاری*

درم خورپەکی لێوەهات بڕوابکەن گەلی خزمینە نەمزانی شەوە یان ڕۆژە ڕۆژی ڕۆناکم لێ دەبووە شەوی تـاری*

حەیران ۱۸۱

حەیران لە کفری و کـەلاری*

ئەو زالمێ لە بابێ زالم ئەمنی کوشتـیە بە دوو چاوی ڕەش و گەردەنی زەردی بەخـاری*

ناوەلا شێت و شەیدایان کردیمە سەرو زولفی لە خۆڕا سۆرو دوو برۆی کەوان و ڕەنگ و ڕوخساری*

حەیران ١٨٢

حەیران لە گەڕێ شاسواری*

ئەمن بریندارم بە تیری برۆ کەوانان بە قولیچکێ چاوی چاوشینان ناوەڵا بەناوقەد باریکی گولیزاری*

چبکەم زەمانی کوڕینی حەیرانێ بەدرێ خۆمیان نەدامێ ئەڵحانیش ئەو درە کەسادەو خەمگیرمم هەر لۆی دەنـاری *

تیبینی : ئەو حەیرانەم دانا لەسەر داوای پیاوێکی (٨٢)ساڵی بەناوی حاجی ...... گۆتی ئەلحانیش درم لۆی هەرداوێ .

حەیران ١٨٣

بەژنی حـەیرانێ برندە دەرێی شترە چنارە*

کەتمەوە دەشتەکەی شنۆو لاجانێ گەلە تامەزرۆمە بگەمەوە شارە جوانەکەی قەلاو منارە*

گەلی دۆست و برادەران نەچنە هەندەران ئەوەی نەیدیتبی نازانی وراتێ بێگانان چەندە غەریب و دژوارە*

حەیران ١٨٤

حەیران لە هەورازو نشێـوو نـەوی*

خوا نەکا ئەوڕۆکە کەس بـە دەردی کۆڕۆنای بکەوی*

نەخۆشی ومردن خەراتی خوایە ئامان داخەکەی لەدرێ من خۆ هەتا چەند ڕۆژان کەس تـخونیشت ناکــەوی*

تێبینی/ پەتایەك ساڵی ٢٠١٩ لە شاری نوهای وڵاتی چینەوە هاتە زۆربەی وڵاتانی جیهان هەزارەها خەڵکی کوشت.

حەیران١٨٥

وەکی هەست لەخۆم ڕادەگرم ئەوەی شنگ و تاقەت بی نیتم پشتم چەمایـە*

دەچمە پێش ئاوێنەی تەمەشای خۆم دەکەم ئەوی داوی ڕەش بی لەسەرو ڕدێتم نەمایـــە*

هاوارتە لەخۆم بەخوای دەردی پیریم گـەیشتێ ڕومەتم لۆچ لۆچ بووەو بەری چاویشم داچۆڕایـــە*

حەیران١٨٦

لە زووری شێخ سمایلی زەینی خۆم دەداوە غەرێ قوچەکێ*

هۆبەو هەواری مامەسێنی وبامەندان چەندە جوانەوەکی بواران هەردەدەن لەپانتایێ گەرمکێ*

خۆزی بەخۆزیدارێ دنیـایێ ئەو بەژنبرندو ڕەش ئەسمەرە دۆست و گراوێ خۆمبا سـارە وەختەکی*

حەیران ١٨٧

کەندێ کۆدەرەی دوورو قـۆرو درێـژە*

هۆبەو هەواری مارێ حەیـرانێ ئاوا دەبوون لە زورگەزراوی بەسەر دەکەتن لە بازارگەی شۆڕدەبوونەوە قەراجێ سەر بەرەو لێـژە*

دەمگۆتە حەیرانێ سەرێ چەند سارانە دۆست و گراوێ خۆمی ئەگەر بە قسەی بەدکارانم لەگەر دەکەی دەوەرە بەدەستی خۆت بمنێـژە*

حەیران١٨٨

حەیران لە گردەبۆر و برایم باولی*

مخابن لۆ ئەو گوندانە سەرێ چەند سارانە بەجێمابنە هەر بە کاولی*

هـەرچی بووە باعیزی چۆلکردنی قەراج و کەندیناوەو شوان و شێخ بزێنی ئۆباری من و ئەو خەرکەیان بەملی*

حەیران١٨٩

دەمگۆ دوبز دوبزە*

حاوێ شەناغەی چەندە جوانە بەهەموو دەمان پڕ لە سۆنەو کۆترو پۆڕو مامـزە*

ئەوەی خراپە بی بەخۆم شك نایێ نازانم کورتێ بەدرێ خۆم لۆ ئەوها لەگەرە من درگرو عاجـزە*

حەیران ١٩٠

حەیران قورینگە لەگەرێ هەرکەوێ*

وەکی گەردەنی خۆی هەردەکێشی شەوی تاریك ڕۆناکدەکاتەوە هەروەکی مانگـەشەوێ *

دەمگۆ بەگزادە دەڕۆم و سەفەریـمە درم مەشکێنە لە گەردەنێ زەردو جوانت ڕامووسانەکم دەوێ*

حەیران١٩١

ناودارۆکان لەمن بەدار بەڕوو و ئەسپینداره*

دەنگۆ بە چاوێ من بڕۆننێ کیژو کارێ سولاوك و بێرۆکان وەکی دێتەوە لە ڕووبارو کانیان ئەو بەژن درێژو ڕوو بەخارە لەناو هەموویانڕا دیاره*

ئەوە حەیرانەکەی من سوار دەکەن لۆ مارو مێردان ئۆمەرمەندان دەستم ناتگاتێ دەمگۆتە براو برازاو خوارزاو خزمان ئەنگۆم وەرنە هاواره*

حەیران١٩٢

گوندێ مە بەبنە مێوو دار هەنجیره*

حەیرانەکەی من ڕاوەستایە لەبەر هەیوانێ هەردەرێی کیژە وەزیره*

ڕومەتی حەیرانی دەشوبهێنم بەهەناری ئاژگەو ئارمەوانێ چاوو برۆی بە کەوەکانی قەرەچوغی ئەنگۆ نازانن سینگ و مەکی هەردەرێی قاشەپەنیـره*

حەیران١٩٣

بەینی شەوەك و مەلائۆمــەری بە سوسکە و کەوه*

ئەگەر ڕۆژێ جارەکی گەردەنێ زەردی نەبینم ڕۆژێ ڕۆناك لەکنە من هەر دەرێی تاریکە شەوه*

کوڕدەرێ حەیران کودەزانم خوا بەحەقە ئەوها دەزانم ئەتوو نادەنە من دەوەرە لە ڕکێ باب و برایان بە کراسی بەری بەگەرمکەوه*

حەیران١٩٤

گردی پیرداودی لە من برندوو بەرەو بایـــە*

داخەکەی گرانم جەنازەی گەلەك گەنج ولاو وپیر و جەوانی تێدایـــە*

حەیفم دەمینی ئەورۆ دوو ڕۆژە کاکە شێروان شێروانی لە عەزیزوخۆشەویستان و بەرنامە جوانەکەی ماڵی ڕەسەن دابڕایـە*

حەیران١٩٥

کیژدەیگۆ ئەوە سواران دەچنە قۆشەنێ سوارێ بەرایی مایندکی بەڕەختی کەلەکەوێتە*

بەسەرو تیلاك و ڕانکۆ چۆغەری مەرگەیی بەری ڕا دەزانم ئەوە حەیرانەکـەی منە دەك ببمە خاکی بەرپێتە*

هەی بەقوربانی سەروسـواریت بم ئەتوو ئەوەندە توندو تۆری لەسەر خانەی زینی لۆیێ هەتا دەمرم هەر تەمام پێتە*

حەیران١٩٦

ئەوە سەرێ چەند سارانە کوشتەی دووچاوی هەمینێـم*

کیژێ حەیران خۆ هیشك بوویمەوە ئەوندەی دوور بە دووری لە بەژن و بارایێ باریکت ڕامینێم*

دەوەرە با بتکەمە نۆ بووکێ سارێ دنیا مەرگ و مردنە نەوەکە کتوپڕ سەر بنێمەوە بەو ئاخ و کەسەرەی نەمینێم*

حەیران١٩٧

حەیـران لە زووران لە زووری شێخەمینی*

هەور زگی لە عەردی دەنا لەلایـێ قیبلەی بروسکان دەدا ناوە ناوە گەوارە دەشریقێنی*

دایدەدا تەزرەو بارانێ لەئاقاری شەناغە و پەرکانە و سەربەشاخی ڕەتی دەکرد لە سەروچاوەی دەربەندی دەیکردە کرێوە لە لولەلـولەی جاستانێی مام سابیر کاکەشینی*

حەیران١٩٨

بیـرەبات خـۆشە جانەو تیکالۆ لەپارە*

هەرەتی عەولاقات و دەربەندی پڕلە کارمامزێ گەردەن بـەخارە*

گەلە پیاوی عەگیدو خـانەدان سەرێ خۆیان ناوە داخەکەی گرانم لەپاشەوان ئەو گوندانە غەریبیان پێوە دیارە*

حەیران١٩٩

ئەوڕۆکە لەجێێ ژوانێ برینی کەون و نووم لێ دەکولاوە *

ئەمن چەندی هەست ڕادەگرم و لێدەدەم دالغەو فکرو تەخمینان ئەوەی شەرت و پەیمان بی ئەوڕۆکە نەماوە*

دەزانم برینێ تیرو خەنجەران ڕۆژەکێ هەر چادەبن ئەمان برینێ کەونە یاران بە ئاسانی ناگرن قەتماغێ خوایە لە جەرگی بەدکاران ببتە تیراوە *

حەیران ٢٠٠

کیژ دەیگۆ دەستە خوشکینەئەوە دیتە گوندیمە کۆمەرەکـێ سواران*

بە گورگە لۆقە دەڕۆن هەندەیان نـمایە بێن و بگەنە زەویەکەی بەرمـاران*

دەمگۆ ئەگەر کوڕە لاوکێ منیان لەگەردابی دەبی ئەوشۆکە هەتا مەلا دیتە بانگدانێ بینویتم لە بەینی شەمامـە وخـاران*

حەیران٢٠١

لەسەر گردی باشتەپەی دەمگۆت عەلیەدۆر عەلیـەدۆرە*

قەدیم و زەمان گویم لێبـوە و زانیتم دەڕێن جێیێ چاوڕەش و کارو کارمامزی سۆرغەر باقرتە و گردەسـۆرە*

دەمگۆتە حەیرانێ ئەوە سـەرێ چەند ڕۆژانە نایەوە جێراوگەی ژوانێ خۆ لەبەر دووچاوێ توونەبی کیژوکار لە گوندیـمە گەلەکی زۆرە*

حەیران ٢٠٢

حەیران لە گەرارە و چـۆمان*

کەس نازانی ئەو بەراو نەخۆشیە چیە ئەوە سارە وەختەکە هاتیە لۆمان*

داخەکەی لە درێ من گەلە عەزیز و خۆشەویستی لێکدابڕین هـاوارتە لەخۆمان*

حەیران٢٠٣

حەیران مامز بوو لە بنە بنەی خۆشاویٚ*

ئەمنیش ڕاوچیبووم لەدوایێ ڕاوکەران پێیان نەدەگیرا بزریان دەکرد لە کەندو لەندی لـهێبان و سێقوچان و دەرماناویٚ*

دونێ دەیگە یشتمێ دەیگۆ لاوە ئەوجارە بەتاقی تەنێ وەرە ڕاویٚ خۆت لۆ دەکەمە کێروشکەکانی ناو قۆپەنێ ئەوجا بەکیف و درێخۆت دەو باویٚ قۆرتێ گەردەنێ بـۆنکە دوو چاویٚ*

حەیران٢٠٤

حەیران لە داربەسەرو گـۆمەشینی*

یارم کارمامزەکی سۆرغـەری بەتاوە لە بنە بنەی تارینی*

دونێ بەژنێ باریك جوابەکی لۆ هەناردیـمە دەریٚ یان ئەوەتا بێ بـمخوازی یان یەکجاری با وازم لێبینی*

حەیران٢٠٥

حەیران خێرە ئەوها بە خان و مانی لە زار هەیوانێ ڕاوەستـای*

لەپێش چاو و دریمن هەردەرێی کیژە ئاغە و میـر و بەگلەرو پاشای*

دەمگۆتە پێناویٚ لۆم بریٚ حەیرانێ لەبەر لۆمەی عەبدان نەبی چبکەم ڕۆژ هەتا ئێواریٚ تێر نابم لە تەماشـای*

( کەوێکی جوان لەگەر فەرخەکانی لەناو پەرێزێ )

حەیران ٢٠٦

دەمگۆ خوایە دەنا هەموو سەر لە سبەینان هەرکەیە بایەکی شەمـاری*

ئەوە حەیرانە گچکەلانە بە گێسکەکی دارگەز بە تاقی تە نێ هەوێرێ کارو بەرخان دەمـــاری*

دەبا بدا لە سەرو پەرچەم و زولفان بەشکم لێم بەدیار دەکەوی گەرێ خەناوکەو گەردەنەکەی زەردی بەخاری*

حەیران ٢٠٧

حەیران لە بانەموردو بەلەبانێ*

حەیرانەکەی من لەگەر دەستەخوشکان بەدایمە لاتەریك دەڕوا لۆ گێسك کوتانێ*

تیچاوەکم دەدایێ سەری خۆی برند دەکرد گەردەنێ زەردی دەبریقاوە دەتگۆت ئاوێتەیە دەیگێڕن لەناو خەنەبەندانێ*

حەیران ٢٠٨

مامە خەتیبیان لە دۆری ڕۆستێ لەقەد بنـاری*

مارێ بابی حەیرانەکەی من وا دەچنەوە بنگەو هـــەواری*

ئەوە حەیرانەکەی من چونکە داکی حەسرزادەیە تـیچاوەکی هەر لەمنە لۆیێ بەنابەدری دەڕوا لە دوایێ کۆچ و کـۆچبـاری*

حەیران٢٠٩

حەیران لە ئاخۆڕەو بـەردبـڕی*

هەورەکی ڕەشی تاری دەهینا دایدەدا تەزرە و بارانێ وەردو شۆی ئاودەدا کەندو جۆمی دادەدڕی*

ئەوە مارێ بابی حەیرانێ چوینەوە بنگەو هەواری حەیرانەکەی من گەلە شلکە گەلە نەفامە زۆر دەترسێم نەخۆش بکەوی بەرگەی ئەو ساردی و سەرمایەی نەگــری*

★ ئاخوڕەو بەردبڕ: دوو گوندی جوانن لە بەستی شەرغەی.

حەیران٢١٠

دارەکەی دیدەوانی هەر لە قەدیـمەوە دەرێن دوولکە*

مەمکی حەیرانێ هەناری هەڵەبجەیە ناوەڵڵا دەرێی سێوکانی باغی شنۆیێ سەرلکە*

سەرێ چەند سارانە ئەو غەدارداکە دۆست و گراویێ خۆمە ئەو سارەکە بەقسەی بەدکاران بەینمان بوویتەوە هەورازو ڕکە*

حەیران ٢١١

ئەرێ حەیران خۆ دەزانم ئەتوو نە بازی نە شەهێنی نە کۆتری*

ئەدی لۆ ڕۆژ لە ڕۆژێ لەپێش چاوو درێ من لە ئەلمۆدەی هەموو شارانیش جوانتــری*

ڕاستە ئەمن بەناوسار کەتیمە ئەمان بڕوابکە درم وەکی کۆتەرەدارەکانی دەوڕووبار و چۆمان نە هیشك دەبی و نەدەمـری*

حەیران ٢١٢

دە مەرۆ مەرۆ با بتگەمێ هۆ هۆ کیژۆرە نازێ*

ئە من بە ژنت دەچوێتم بەشترە نەمامەکانی باغی عەنتابی گەردەنت بە وان قورینگ و قازێ*

خۆئە من سەری چەند سارانە چاوەرێی توومە تازە ناتوانم بگرم چ دۆست و یاران بەخوای لەتوو بترازێ*

حەیران ٢١٣

حەیران لە مامە و عەلەغـێری *

ئەوە چەند جارە بەژنێ گچکۆکە جواب لەسەر جوابانم دەنێرێ*

دەرێ هەتا نەرۆیشتینە لۆ بنەگەو هەواری دەبا بێتە جێژوانەکەی لەجاران تێر بە درێ خۆی ئەوجارەش دەست لە شەمامان بگێـرێ*

حەیران ٢١٤

حەیران ئەتوو منداری گەلە لەپێش درێ من منداری*

قورینگێ دەو ڕوبار و گۆمان کۆترێ سەر لیسی کارمامزەکەی لەناو ئاقـاری*

کچێ شەنگ و شۆڕ وەکی لۆ من دییەوە جێراوگە و ژوانێ ڕوومەتت دەبراچێ دەرێی مانگی چاردەیە هەراتیە لە بەینی هەوروسامـاری*

حەیران ٢١٥

حەیران لە هـەورازو نشـێـوی*

کیژ دەیگۆ دەوەرە با دەمەکێ پێکەوە دانیشین دوو بە دوو لەبن کەپرەکەی دارە مێـوی*

بکەینەوە گرێێ درێ خۆمـــان بزانین کیها کولترین بەوێ داخ و کەسەرێ ئەمان توخوا لاوە چ پەلان نەبزێـوی*

حەیران ٢١٦

لەبان و بانان لە بانە سماقان*

ئاورێ خۆم دەداوە بەستەکەی شەرغەی کیژو کارێ بەلەبان و نێرەگینێ پێکرا دەیانکرد هەپۆك و قیزبەلەو پیفۆکان*

خۆزی بە خۆزیداران باجگرێ ماچان بام هەموو بواران لە بناری دیدەوانی لەوان کیژۆرە شێخان و مەنتکان *

★ هەپۆك و قیزبەلەو پیفۆك: هەرسێکیان لە بواران شین دەبن خواردنیان بە سوودە خۆرسکن.

حەیران٢١٧

دیسانەکە برینێ کەون و نووم لێ دەکولاوە*

سەرێ چەند سارانە شوان وشێخبزێنی و قەراج و کەندیناوەمان لێ زەفتکراوە*

ئەو گوندە جوانانە چۆل و هۆل کـراینە داخەکەم دیوەخانێ عەگیدوپیاوە ماقولانیش بوویتـە کەلاوە*

حەیران۲۱۸

حەیـران لـە دەراوو کـانی و دۆران*

ژوان گەلە خۆش بوو زەمانی کوڕینی لە سایەو سێبەرێ لەگەر ناسکە کیـژۆران*

حەیرانێ خۆت لەگەربی لەناو کوریکە نیسان وحاجیلەو شیلانێ لە بنارێ سەفینی لەبەینی زیارەت وخـۆران*

حەیران۲۱۹

مارێ بابی کەونە گراوییەکەم لەپەنای گردی*

کەس نەیدەزانی وەکی پاوانێ من بوو جۆتە شەمامەو گەردەنـــێ زەردی*

هەرچەندی دەکەم لە درم دەرناچی ناحەزو بەدکار کو پێیانزانی بێ سوچ و قەبیحات لەمنیان کـردی*

حەیران ۲۲۰

شەیتان قەرا گەلە بەسام و هەیبەتـە*

قەدیم و زەمان هێلەوەو سیاو جێی شۆڕەسواری وەکی حەبیبی بەشان و شەوکەتـــە*

کیژ دەیگۆ حەیران چاك دەزانی ئەمنت بەخۆشی نادەنێ لۆنایێ پیلم بگری دەرمبینی هەی لەمن نەکەوی لۆ کەینێتە ئەو غیرەتـە*

حەیران ٢٢١

بەسەرێ کێوەڕەشی داکەتم لەمن بێ دارو بـارە*

دەچمەوە دۆرێ کاولە شـاورێ  گەلە بەجۆگەو کانیاو و ڕووبارە*

دەنگۆ بەچاوێ من زەیــن دەنە قەدپارێ ڕەوەزە  شاخان چەندە جوان دێن و دەچن کارمامزێ  گەردەن بەخارە*

حەیران ٢٢٢

لە سەرێ قەرەچوغی زەینێ خۆم دەداوە دەشتی قەراجێ چەندە جوان لەمن دەغەمــرا*

حەیرانەکەی من کارمامزەکی گەلە سرك و ڕەوك بوودایمە لەقەد تەلان و شاخی بەچ دەمان نە دەخافرا*

هەندم هەناردە داخوازی حەیرانێ حاجی و مەلا و خەلیفەو شێخ و پیاوماقوولی خین و مەسرەتیان چبکەمێ باب و برایێ حەیرانێیان پێ ڕازی نەدەکرا*

حەیران٢٢٣

دەمگۆ ڕانیە وقەلادزێ ئەودیـو ئەودیوی کێوەڕەشی*

ئەو بەژن درێژە ئەمنی کوشتییە بەلەنجەو لارو خۆبادانی لەگەڕیی شایێ ناوەلا بە تەبەش پانی و دووچاوێ ڕەشی*

کیژێ بەگزادە دەوەرە پـێمبرێ ئەتوو کیژە  ئاغەو بەگلەرو کێخوای یان کیژە ڕۆژهەراتی لە بەگزادەکانی مەنگوڕو مامەشی*

حەیران ٢٢٤
بەنی هەریرێ پایزان بەهیشکە بایـە*
خۆزگەم بەوێ دەورو زەمانیکا وەکی بواران مەڕم دوو جار دەیناوە بێرێ حەیران
دەهاتە گۆمێ شیرناوێ چەندجاران جەڕەو کونـدەم پێ دانایـە*
حەیفم دەمینێ ئەوە سەرێ چەند ڕۆژانە مەیلی جارانی لەگەرە من نیە هیچم
بەخۆم شکنایێ سەرم لەخۆم سوڕمایـە *

حەیران٢٢٥
لە زووری شێخ سمایلی زەینێ خۆم دەداوە گورگەو سرێمان بەخشیان و
سەرگـــەڕان*
خۆزگەم بەوێ دەورو زەمانیکا وەکی ڕاوێ خۆمان دادەبەستا لەبەینی لهێبان
وخۆشاوێ لەگەر کۆمەرەکێ ڕاوکەران*
کارمامزەکی سۆرغەرمان هەر دەستان لە بنارێ قەرەچوغی بەسەردەکەت بەرەو بناری
دەیگرتەوە تی و تی شاخان بزر دەبوو لەگەرێ سەنگـەران*
★ تی وتی شاخان: بەو باریکۆکە ڕێیە دەگۆترێ لە قەد شاخی چیایانە.

حەیران٢٢٦
حەیراُن لە دووکەرەو سۆربەشـی*
نەرێی گەورە کیژو قەیـــرەمە لەپێش چاو و درێ من ئەتوو دەرێی زێڕی عەیار
بیست و چاری بێخەوشـی*
نە لەجوانی نە لەبەژن و بـارات کەمە ئەوەندەش عەرێم گرانی نازانم نە قسمەتی
خۆتە نەهەروەکی من بەخت ڕەشی*
* دووکەرە و سۆربەش: دوو گوندن سەر بە قوشتەپەنە لە دەشتی مرکیەی.

حەیران ٢٢٧

وەسیەتبی لۆ گەنج ولاوان نەکەونە داوی عەشق ئەوها بەئاسانــی*

چونکە دربەخەم و بریندار دەبن لەبەر بێشەرتی و بێپیمانی ئەوێ زەمانی *

برینێ شیرو تیروخەنجــەران هەر چادەبن ئەمان برینێ کەونە دۆست و یاران هەتا ڕۆژێ مردنێ نابڕێتن ئازارو ژانی*

حەیران٢٢٨

حەیران لە بیرەبات و جاستانـــێ*

خۆزگەم بەوێ دەورو زەمانیکا وەکی مارێ بابی حەیرانێ هۆبەو هەواریان دانابوو لە زووری ناوبەندانــێ*

ئەوە حەیرانەکەی من هەردەتگۆ کارمامزە دەڕوا لۆ بەرو بێرێ هەرچەندی دەمکرد تێر نەدەبووم لە تێرامانێ*

حەیران ٢٢٩

حەیران حەیرانە حەیران سۆدەیــە*

حەیرانەکەی من نە کیژە بەزازە نە کیژە ئاغە و بەگلەرە خۆ نە ئەلمۆدەیــە*

حەیرانەکەی من لەوان سووکە ژنەکانی دەست بە بازن و تەونکارە وەکی دادەنیشن لەسەردارەکەی تەونی نەخشێ هەردەگرن بە نووکی پەنجەی هەردەرێ بەگزادەیە*

حەیران۲۳۰

گەلە نـەخۆشم هۆرو دۆرم نەمایـە*

بەسم بگێڕن لەخەستەخانان دەردێ منیان پێ ناکرێ دەوایـە*

بە قسەی من بکەن جوابەکی بدەنە دووچاوێ ڕەش و بەژنەکا برند دەمەکێ بێتن لەکنم دانیشی بەخوای هەر ئەو لۆ من دەرمان و شفایـە*

★ هۆرو دۆر: واتە شنگ و تاقەتیان هێز لێبڕان.

حەیران۲۳۱

حەیران لە ئەشکەو سەقایێ*

خۆزگەم بەوێ دەورو زەمانیکا وەکی پێشی بەیانیان مەڕم ڕادەدا چەندە خۆش دەهاتە گوێم دەنگی بانگ و سەرایێ *

داخەکەی لە دریمن ئـەو دەشت و دەرنەما هەمووی چۆلکرا پەرگەندەبووین لە شاران ئەڵحانە کە داخەکەم کەس بە هاواری کەس نایێ *

حەیران۲۳۲

حەیران لە کێوان لە کێـوەڕەشی*

هەرچەندی کردم حەیــرانێ بەدرێ خۆمیان نەدامێ لۆیێ لەحەژمەتان بەدایم ئازای بەدەنم دێشــی*

خوایە دەنا عیزرایل بێتە خوارێ لە حەفت تەبەقەی عاسمانان ڕوحی هەرچی ناحەز و بەدکار هەیە بکێشی*

حەیران ٢٣٣

حەیران لە سێگرتکان و ئـۆمەر گومەتـان*

ئەوە چەند سارە دۆست و گـراویێ خۆمی جارەکێ لۆم نەهاتیە ژوانێ وەختە بمرم لە سوو وحەژمەتـان*

دەیگۆ لاوە دەوەرە پێش بمخوازە بەحەراری ئەوجا پێکەوە دەچینە ناو ڕەزو باغان لۆ خۆمان گەلەك دەکـەیـن کەیـف و سوحبەتـان*

حەیران٢٣٤

گەلە نەخۆشم بەپەتایێ کۆڕۆنەی کەتیمە لەناو جێ و بالینگانێ هەر ئەوەتۆکە نوزەمـدێ*

دەمگۆتە برایان و کوڕان وخزمان بەسم بگێڕن لەکن دختۆران شنگ و تاقەتم نما لەگەر حەب و دەرزیان وا لاکەمـدێ*

دەنگۆ جوابەکم لۆ بدەنە داکێ حەیرانێ دەبا لێگەڕێ حەیرانە گچکەلانە دەمەکێ بێ لەکنم دانیشی بەخوای بە دەستەوی هەر ئەوێ دەمای شفامـدێ*

حەیران٢٣٥

ئەمن هەرچەندی دەکەم و دەکەم دەنگم دەرنایـێ*

ئەوەندەی هەست ڕادەگـرم لە کۆڕ و دیوانان مەجریسی پیاوماقوول وخانەدانان لە تازیەو خێرو شایی و گۆوەندان چبکەم دەنگی بابە بۆنخۆش وجوانەکەی خۆمم لە گوێیانم نایـێ*

توخوا گەلی براو خزم و جیرانان قەت لۆمەی درێمن مەکەن خوا پێی ناخۆش نەبی پاش دابڕانێ عەزیز و خۆشەویستان چ تام ولەزەت لۆمن نەما لەسەر دنیایێ*

★ ئەو حەیرانە ڕاستە لە سەر بابی خۆشەویستمە بەڵام گشتگیریشە لۆ عەگید و خانەدانەکانی دەورێ بەرێ.

حەیران٢٣٦

کیژ دەیگۆ دەستە خوشکینە وەرن بکەن مشاوەرە و تەگبیرم *

ئەوە سەرێ چەند سارانــە وەکی کەوەکانی ناو قەفەزێ بەندو ئەسیرم*

هاتتە سەرم لەڕکان خۆم سەراوسەر فڕێدەمە خوارێ لە خەرەندی ئەمان لەخۆفێ

خودایێ گەورەو لۆمەی عەبدان ناوێـرم*

حەیران٢٣٧

حەیران لەسەرێ  تارینی*

دەگەڕام لە ڕەشەڕاوێ لەبنەبنەی کاولە سەفینی *

کارمامزەکم هەردەستاند گەلە سرك و توړندی بوو نەدەگیرا دەیگرتەوە لێوێ

بەستۆڕەی ئاوا دەبوو لە زووری خانزادێ ڕووی خۆی دەداوە ئاقاری باشبراغ و

پیرزینــــی*

حەیران٢٣٨

پەرکانەو شەناغەیان لێکردینەوە  کەسەرو غـەم*

خۆ هەرچەندی فکر و تەخـمینان لێدەکەم و سەردەینم و دەبـەم*

چونکە مەفتەنێ باب و باپیرانە یان خینی خۆم دەرێژم بەخودای یان ئەوها بەئاسانی

لۆیان چۆل ناکـەم*

حەیران٢٣٩

کەندی عالاو چەڵتوکی لەمن بە کفرو گـەزە*

پێش دەرکەی مارێ بابـی حەیرانە گچکەلانەکەی من بە باخچـەو ڕەزە*

کیژ دەرێ کۆمەرەکێ سـواران وا دەگەنە سەر بیرەکەی حاجی ڕەحمان گەراری حەیرانەکەی خۆم دەناسمەوە سواری ئەسپەکی شێیـە ڕانکو چۆغەری لەبەری بەدایم سۆری مەرەزە*

حەیران٢٤٠

حەیران لە دۆرو دۆران لە دۆرێ هەنجیران*

سەرێ چەند ساران گـەڕام لەکن شێخ و مشایەخ و چاك و پیران*

چبکەم مراز حاسر نەبووین هەناسە ساردیان کردین لەگەر حەیرانێ نەبووینە دۆست و دەستگیران*

حەیران٢٤١

* شەناغە لە گەڕێ گابەرەکە لەقەد تەلانی

مارێ بابی حەیرانێ بارکرد دەیانگرتەوە ئاقاری پەرکانەو سەربەشاخی ئاوادەبوون لە زوورگەزراوی دەپەڕینەوە لە ئاوێ مەخشومە و شێخانان دەرێن هەواریان دادەنێن لە هەرەتی گردەسۆری لەبەینی پۆڕیجەو گەڕەشێخانـی*

دەمگۆ هەرچی دەبتەوە باعیزێ دوو دران کەڕبی لە گوێیان کۆرەبی لەچاوان خوایە گیان دەنا لاربی لەزمانی*

حەیران٢٤٢

ئەوە بوارە وەختی مـار وەدەرە*

حەیرانەکەی من لەچاوو برۆیان شەهێنە بەژنی باریکی دارئەسپنداره له ڕفت و ڕۆینی دەریێ بازو سەقەرە*

کیژ دەیگۆ بەخوای تازە ئەمنت بەخۆشی نادەنێ وەره با دەستێ ییێك بگرین له وراتی بچینە دەرە*

حەیران٢٤٣

حەیران حەیرانە حەیـران بنارە*

حەیرانەکەی من لە گوێیانی گوارەیە لەسەری دەسرۆکە بەدایم مل بە هەوری و هیزارە*

سەرێ چەند سارانە بەتەمای یێکدی بووین ئەو سارەکە لێکیان دابڕین بووینە مارداری کارەکەی ڕەنج بە خەسارە*

حەیران٢٤٤

حەیران لە سەروچـاوێ*

بەگزادە ئەتوو بۆنت لەخۆڕا خۆشە چاوانت ڕەشن سەرو پەرچەمیشت سۆرو جوانە چ عەترو گوراوو کل و کلدان و خەنەو وەســمەی شارانت نـاوێ*

ئەوە نەخۆشم توخوا جـوابەکم لۆ بدەنە ئەو ڕفت و ڕۆین جوانەی دەمەکێم بێتەوە سەرینێ بەخوای چادەبم چ دختۆرو دەرمانـم پێناوێ*

حەیران ٢٤٥

گەلە بریندارم دەمگۆ دە توخوا جوابەکم لۆ بدەنە کیژۆرە جوانێ*

دەبا بێتەوە سەرینم گەلە بەخان و مانی سەرم لەسەر ڕانەکی نەرم و شل دانـــێ*

ئـەوجا لۆم بـگرتەوە دەرمان و مەرحەمان بە ڕوونێ زەیتونێ بە گورە حاجیلەو ڕەشکە و شـمریان دەبا سەبرۆکە سەبرۆکە بەپەنجەیێ نەرمۆکە برینۆکەم لۆ بکاتن هەتوانـــێ*

حەیران ٢٤٦

گەلە نەخۆشم ئەوە سەریێ دوو مانگانە لە دووڕ ژۆرێ لەناوجێم*

هەرچەندی تانان لەخۆم دەدەم داخەکەم لۆ عاجزیێ درێ خۆشم ناتوانم دووسێ حەیرانان بڕێـــم*

جوابەکم لۆ بدەنە حەیرانبێژو خۆشەویستان بێن دەورەم لێبدەن گەلە مەترسیان دەکەم ئەوجارە لێیان دابـبــڕێـم*

حەیران ٢٤٧

هەموو بواران بنارێ کوڕەسی لەمن بە هۆبەو ڕەشمــارە*

کیژ دەیگۆ کورە حەیــران مار وێران ئەوە ئەتوو چاوت لەکــێ دیــارە*

وا بەزۆری زۆردار قرێرم لێ وەردەگرن و مارەم دەکەن ئەمنیش چ دەسەراتم نیە هەی لەخۆم سەر بەهەش و تارە*

حەیران٢٤٨

حەیران لە کانی گەنــی*

ئەوشۆکە لەخەوێ شیرنـدا نەمدەزانی لۆ ئەوها کتوپڕ دریژگەم ڕاچەنی*

خۆم گەیانــدە پێناوێ دەیـگۆ لەخۆم شەرمەزارێ دونێ ئێوارێ حەیرانەکەی تویان مارەکردیە بە نابەدری حەیف ومخابن ناحەزو بەدکاران پێ دەبن خەنی*

حەیران٢٤٩

دەمگۆ دەوەرە وەرە خۆشـەویستێ بەدرێ خۆم دەوەرە*

دەزانم ناتوانی بێـیە جێێ ژوانێ خۆ پێتدەکرێ ڕۆژێ جارەکێ لە کۆشك و تاق وپەنجەران لۆمن سەر بینیـە دەرە*

ئەتوو نازانی سەرێێ چەند ڕۆژانە لە دووری دوو چاوێ ڕەش و جوانت ئەو درە کەسادەی من پڕ لە ئاخ و دەردو کەسەرە*

حەیران ٢٥٠

شێخ شەروان خۆشە مەرقەد لەپـارە*

دەو کەندەکەی کۆدەرەی هەموو بواران بە هۆبەو هەوارو ڕەشمـارە*

مارێ بابێ حەیرانێ چوینەوە بنگەو هەواری وەلا لەوێ ڕۆژێوە هێتیم کەتیمە ڕەنگ و ڕووم زەردە و لێوم بەبارە*

حەیران ٢٥١

دەشتی قەراجێ نوارە بە نــوارە*

ئەوە کۆمەرەکێ ســواران دێتەخوارێ لە قەرەبۆتك و قەرەبێتکی بەرەو سرێمان بەخشیان و سەرگەڕان بە نەرمە غارە*

گەلەپیاوی عەگیدوخانەدان سەرێ خۆیان ناوە داخەکەم لەپاشەوان دیوەخان و مەجریس غەریبیان گەلەك پێوەدیــارە*

حەیران٢٥٢

بنارێ دێدەوانی بەبنە جاترەو شاوێـرە*

ڕەزو باغی مارێ حەیرانــێ بە بنەمێوو مورتك و گورو کنێـرە*

کیژ دەرێ لاوە سینگێ من دوکانێ عەتارانە ڕازایتەوە بە نارج و لیمۆیان ڕۆژێ دوو جاران لۆخۆت دەستان تێ بگێڕە*

حەیران ٢٥٣

خەمێ لە درم کەم نەبـوو خەمێ حەیرانێشی وا هاتە پــارە*

ئەوە جومعەیە پێش دەرکەی مارێ بابی حەیرانێ بەکەیف و هەڕاو سوحبەت و گارە گـارە*

حەیرانەکەی من سواردەکەن لەخانەی زینی بە نابەدری لەبەر لۆمەی عەبدان و عاشیرەتی گران و باب و برایان نەبی دەبی پیلی بگرم بە زەقەی چاوان بیهینمە خوارە*

حەیران٢٥٤

وەکی بەپێش دەرکەی مارێ بابی کەونە گراویەکەی خۆم دادێم و ڕادەبـرم*

سەرم لەخۆم سـوڕدەمینی براینە کو دەمو دەست بەرنابمەوەو لەوێندەرێ نامرم*

چونکە هەر بەخۆم دەزانم خەمێ ئەو زالـم داکەی چەند زۆرە سەرێ چەند سارانە بوویتەوە کول و کەسەرێ سـەردرم*

حەیران ٢٥٥

قەراتەکـەی هەولێرێ بەدەرکەو تەلارو تاقــە*

لەسـەر چیای شێخ عەبـدولعەزیزی زەینێ خۆم دەداوە شارەکەی ئاکرێ ناوەوەی قەیسەری و دوکانە ئەوبەر ئەو بەری بەرێزەو تاقـە تاقە*

ئەوسارەکە لەگەر حەیـرانێ لێکدابڕاین لۆمەم مەکەن شەوو ڕۆژ خەوم نیە بوویتە گرێی سەر درم ئەو دابڕان و مەراقە*

حەیران٢٥٦

حەیران لە سێگرتکان وئـۆمەرگومەتی*

نازانم نە بەختەکەی مـن ڕەشترە نەخارە جوانەکەی سەر ڕوومەتی*

لەوێ ڕۆژێوە حەیرانـم لێ دابڕایە سەبرو سێبوریم بە کەس نایێ بوویمە مەجنونەکەی دەل و دیوانە هەروەختە بە دەشتێ بکەوم لە حەژمەتـی*

حەیران٢٥٧

زیارەت وخۆران لەپار سەفینی*

دەمگۆتە حەیرانێ دەرێـن دەبتەوە هات و هەرزانی خوا بکا ئەتوم بدەنی دەتبەمە قەیسەری دوکانی هەولێرێ بە کەیف و درێخۆت هەرگرە تاقمێ بوکینی*

ئەوجا دوو بەدوو شۆڕدەکەینەوە زاویتە و ئامێدی و سولافی لۆمانگێ هەنگیی *

حەیران ٢٥٨

دەگەمە هەر دۆست و بـرادەرەکی پێمدەرێن لۆ ئەوها بەدایم ڕەنگ زەرد و لێوبەبـاری*

دەمگۆ توخواکەی ناحەقم مەگرن سەرێ چەند ڕۆژانە لەمن دابڕایە دوو چاوێ بەرەك و گەردەنێ زەردی بەخـاری*

خۆمن شەرتم کردیە پاشی حەیرانە چاوڕەشەکەی خۆم نەچمەوە جێڕاوگەو ژوانان بەخوای لەمن حەرامبی عەشـق و دلـداری*

حەیران٢٥٩

دەمگۆ ڕۆژ هەتا ئیـوارێ بازاڕی خەمانـم گەلە بەهەڕمێنـە*

بەشەویش خەوم لێناکەوی لەبەر دالغەو فکرو خەیاری ئەو چاوباز و ئەبرۆ کەوان و شەهێنـە*

دەمگۆ زێدەجوان دەجارەکێ لۆم وەرەوە جێژوانەکەی لەجاران بەبۆنی شەمامە وخاران غەم و کەسەری درم لۆ بـڕەوێتە*

حەیران٢٦٠

گەلە بریندارم بە برینێ وان کەونە یارانە*

ئەوی نەیدیتبی نازانی برینی کەونە دۆستەکانی بە بەقاو متمان چەندە بە سۆو بەژانە*

قەدیم و زەمان گۆتیتیان برینێ شیرو تیرو خەنجەران دەگرن قەتماغێ ئەمان برینێ کەونە یاران نە قەپات دەبن نە دەکرێن هەتوانە*

حەیران٣٦١

حەیران حەیرانە حەیران خەندانە*

بناری قەرەچوغی بواران کۆگەی برباس و شێروانی و بندیان و ئۆرمزیار و ئۆمەربلانە*

دەنگۆ زەیندەنە حەیرانە جوانەکەی من وەکی خۆ هەر دەشەقێنی دەڕوا لۆ بەرو بێرێ هەردەرێی کارمامزەکانی هەردەو باسکی ڕەوەزە شاخانە*

حەیران٣٦٢

کیژ دەیگۆ هەزارخۆزگەم بە دەستەخوشکانم *

ئەوە هەموو ڕۆیشتن بە مرازێ خۆیان گەیشتن هەر ئەمن مایمەوە خەمکێ خەمانم*

ئەوە سەرێ چەند سارانە بوویمە دەست و پێی براو براژنان ئەمن بەرێ ناکەن ئاهو زوزەم کۆرەیانکا کۆزیان ساواکردم هەی مارەکەی ویرانم*

حەیران٣٦٣

قەراج قەراجە قەراج سەر بەروەو خوارە*

حەیرانەکەی من وەکی دەڕوا لۆدوکان وعەتاران خۆبادانی هەردەرێ بەردیلەکانی قولەی کەوی سـارە*

حەیف ومخابن گەڵەساویلکە و نەفامە بە ڕۆژ قەولم دەداتێ وەکی شەو دادێ بەقسەی بەدکاران ژوانیژگەم لێ دەکا بەتـارە*

تێبینی : مام قورشیدی حەیرانبێژی ڕەسەن گۆتیتی قەراجوك لێژە.

حەیران٣٦٤

دەمگۆتە حەیرانێ ئەتووم بە حەراری بدەنێ خۆ هیچیتکەم لە دنیایێ نـاوێ*

پێمدەکرێ دەستت بگرم دەرتبینم لەمارە بابان هەرچەند سەردەینم و دەبەم حەزناکەم لەگەرداوێ*

ئەگەر ئەتوم نەدەنێ شەرتم کردیە چاو برند ناکەم لەزەری و ئەسمەران پاشی بەژنێ باریکت ئەمن مارو ژنـم نـاوێ*

حەیران ٣٦٥

لە سەریێ کۆڕەسی زەینێ خۆم دەداوە جادەکەی کۆیێ لەگەر گەزەنگی ڕۆژێ چەندجوان دەبریقاوە ئەو بەر ئەوبـەری*

حەیرانەکەی من مامز بوو لەهەرەتی گۆمەشین و گورزەیی دزەی دەکرد لەپێش ڕاوچیان هەر دەکشاوە لۆ سەریێ بێژینگ بەســەری*

بریا لۆخۆم باجەستینێ ماچان بامایە ئەوەلی مانگی ئادارێ لە گەورە کیژەکانی باوەقوب و سماقە و بایزاغەو داربەسەری*

★ تێبینی: بێژینگ بەسەر لە چیای قەرەچوغیش هەیە لە بەرزاییەکانی سماقە و بایزاغەش هەیە .

حەیران ٣٦٦

حەیران لە سماق شیرین و داربەسەری *

بەژن و بارایێ توو دەشوبهێنم بەوان شترە نەمامەکانی شارەبان و مەندەلی وەکی تازە ئەوەل بەری دەگری*

دەمگۆتە خزمان ئەنگۆ لە کێندەرێنە بێنە هیمدادم ئەوە حەیرانەکەی من دەبەن بە بووکینی گەلە بە نابەدری*

حەیران ٣٦٧

دەمگۆتە درێخۆم کا بزانـم لۆ ئەوها مات و بێ زەوق و داماوی*

دەیگۆ ئەدی نازانی ئـەوە سەرێ چەند ڕۆژانە تازیەو شین و ماتەمە لەدەشتی شەمامکێ و گوندەکەی سـیاوی*

بەداخەوە دابڕا لە کۆڕو مەجریسی حەیرانبێژو مەیدانی قۆشەنێ سوران پیاوە بێنازو دەنگ خۆشەکەی هێلەوە و سیاوی*

(دوای ماڵئاوایی یەکجاری مام ڕەحمان سیاوی حەیرانبێژی ڕەسەن ودەنگ خۆش نووسیومە وەکو وەفایەك چونکە گەلە بە غەریبی وکەسادی سەرێ خۆی ناوە) هەزار ڕەحمەتی لێبی.

حەیران ٣٦٨

حەیران لە بەدەن پیربـوویمە ئەمان چبکەم ئەو درە کەسادەی من نامری*

دەمگۆ تە حەیرانێ ئەوە ئازارو نەورۆز ڕۆیشت کەینێ لۆم دێیەوە ژوانێ خۆ گەلە لەمێژە لێم بزری *

دەوەرە با بتگرمە باوەشو هامێزێ خۆم بۆنکەم شەمامەو خارێ گەردەنێ هەتا کفتایێ درم بەتەواوی دادەمری*

حەیران ٣٦٩

حەیران لە بان و بانان لە بانێ نێرەگینی*

دەمگۆتە حەیرانێ ئەوسار هاوینێ گەلە گەرمایە کەپرەکت لۆ دەکەم لەبەینی زیارەت و گەلی شەمان لە نساری سەفینی*

چەندخۆشە لەوێ پێکەوە دانیشین سەرم دانێیە سەر ڕانەکی نەرم وشل بە چاوانم زەیندەیێ سەبرۆکە سەبرۆکە لەبن لێوان لەگەرم پێبکەنی*

★ گەلی شەمان: گەلیەکی یەکجار خۆش و دلگیرە لە بناری سەفینی خۆمان.

حەیران٢٧٠

حەیران چەندم گاسکردی لە دۆرەزەی سەرەوە*

ئەوسارەکە دەردە کۆڕۆنـای هات و لەگەر غەمێ لێکدابڕانێ حەیرانێ لە دریمن یەکیان گرتـەوە*

دەمگۆت حەیرانێ چبکەم بەخۆشی ئەتویان نەدامێ ئەوجارە وەکی هاتیە جێێ ژوانێ بەکراسی بەری بەگەرم کەوە*

حەیران٢٧١

حە یران لە دەربە ند و دەربەندان لە دەربەندی کۆرێ*

ئە وە کۆمە رە کی سواران دەچنە قۆشە نێ تەعلیمی دەکەن لە ساکە گۆرێ*

ئە وە کیژ دەیگۆخوام بە خوارمی سوارێ بەراییکا شلی کردتەوە رستێ جەرەوێ کورە تیم حەیرانە کەی منە ئارەقەی لێدەچۆرێ*

حەیران ٢٧٢

بەینی سابراغ و میرزاغەی بە ملاکە ملاکە*

دەمگۆ بەسم بگێڕن لەکن دختۆرو حەکیمان پەنجەیێ نەرمۆکە نەبی چ داوو دەرمان چارەی دەردی من ناکا*

توخوا بمبەنە خزمەت مامۆستا عەبدولکەریمی دارەتووی چونکە پیاوەکی گەلە بە متمانـەوپاکە*

★ ئەو مامۆستایە مەبەستم مامۆستا عەبدوالکەریمی مزگەوتی ئەسحابەیە لە هەولێر.

حەیران٢٧٣

حەیران لە شێخ جامی و شـێخ شەروانی*

مارێ بابی حەیرانێ بارکرد دەیانگرتەوە ئاقاری گردعازەبان و هێلەوەی بەسەردەکەتن لە زوورگەزراوی بە بەینی دیبەگەو کاریتانیدا دەڕۆیشتن دەچوونەوە قوچ و قەپرانی*

دەمن شەرتم کردیە هەتا ڕوحم لەسەر دنیایێ مابی دەست لەسەر قەدو قامەتی شیرین هەرناگرم نە بەپارەو مرکی دنیایێ نەبە زێڕێ زەمانی*

حەیران ٢٧٤

ئە وڕۆکە گازدەکەم دەریم بە ئۆمەرگومەتان*

کیژدەری لاربم سەت جاری کوڕە لاوکەکەی من دەرین رووی دایتەوە وراتی غەریبیان و غوربەتان*

ئەمنیش مایمەوە لە کاولە خانیان بەتاقی تەنی دۆشدامایمە لەناو خەمو تاری وقەهرو خەفتان*

حەیران٢٧٥

پێش دەرکەی ماڕێ بابێ حەیرانێ لەمن بە گورو کنێرە*

بنارێ قەرەچوغ وسەریـێ بێژینگ بەسەری بە بنە گۆرمزە و شاوێرە*

کیژ دەیگۆ کوڕە هێتیمە لاوە دەرێن دەچیەوە گەرمەسێرێ ئەمن دەتدەمێ
خەناوکەی ملم ئەتووش دەستڕەکەی دەستت لۆ سەبرو سێبوری دران بەپلکە پێناوێدا بنێرە*

حەیران ٢٧٦

حەیران حەیرانە حەیران کیژخانە*

ئەوە سەرێ چەند سارانە درێمن پڕ لە کەسەرو خەم و ژانە*

توخوا قەت لۆمەی دڕێ من مەکەن چاوم هەر لە دوو ئەو بە ژن باریکەیە ئەگەر
برێن داکی حەفت کوڕانــــە*

حەیران٢٧٧

حەیران حەیرانە حەیـرانەکەی من گورچنە*

لە دووری ئەو بەژن باریك و ناولەپ جوانەی جەرگ و هەناوم هەموو تیکە تیکەو
کون کونە*

ئەگەر لەبەر لۆمەی عەبدان نەبی دەچمە سەرخن و برندایيان بە حەیرانەکی
سەرچیایـی دەرێم تووخوا ئەنگۆ نازانن سەرێ چەند سارانە ئەو ناسك بەدەنە دۆست و
گراویێ منە*

حەیران۲۷۸

چەندی هەست ڕادەگرم نازانم ئەو درە کەسادەی من لۆ هەندە بەخەمە*

لەسەر گردەکەی شێراوەی چاوێ خۆم دەداوە چەولنگی پردێ بانیێ قەیباشی دەو ڕووباری چۆمەزەردەرەی لەمن گرتیتی تەمە*

خۆ ئەمن ئەگەر ڕۆژێ جارەکی ئەو غەدارداکەی نەبینم لەناو ڕەز و باغ و چیمەنان وادەزانم سارەکی تەواو لە عومرم کەمە*

حەیران۲۷۹

بەینی چەرت وگێسومەی لەمن بەبرندو نەویە*

ئەوە حەیرانە ڕەشەسمەرو بەژن برندەکەی منە بەداخەوە لەناو گەڕی شایی لەگەر هەرپەڕینێ هەوری سرکەیی لەملان کەتیە*

ئەگەر حەیرانێ بەدرێ خۆمم نەدەنێ هەتا ئەو ڕۆژەی هەناسەم لەبەر بگەڕێ بەدەستە خۆم نیە چاوم هەر لەویە*

حەیران۲۸۰

بەقەراتان بە قەراتە جنێ*

دەمکۆ ئەگەر لێم بگەڕێن پاشی دووچاوێ بەرەك جارەکیتکە قەت ناینمەوە ژنێ*

توخوا لۆمەی درێمن من مەکەن ئەنگۆ نازانن دەردێ لێکدابڕانێ گەلە ناخۆشترە لە دەردێ هەجەل و مردنێ*

حەیران٢٨١

لە قەراتان لەقەراتێ کاولە دوینێ*

حەیران ئەوەندەی چاوەڕێم کرد لە کەنگێ هەتا کەنگینێ*

چبکەم لێم بوویە دیدارحەسرەت و قاتی ئەتوو نازانی لە دووری توو جەرگ و هەناوم بوویتەوە گۆمەکی خینێ*

حەیران٢٨٢

عاڵڵا قەدیم و زەمان بە کۆڵ و بیرە*

خۆزگەم بەوێ دەورو زەمانیکا وەکی حەیرانەکەی من دەهاتەوە لەسەر بیرەکەی حاجی ڕەحمانی گەرارِی لەخۆبادانی بەژنی هەر دەتگۆت تولە مێوە با دەیهەژێتی تازە گرتیتی پەسیرە *

حەیفم دەمینێ لۆئەوان گەورە کیژەکانی مایەنەوە بەبێ مورادی لەمارەبابان سەرێ چەند سارانە بووینەوە دیل و ئەسیـرە*

حەیران٢٨٣

لە گەرمان لە گەرمەسێـرێ*

ئەوسار سارەکی بێ بارانی و ڕوو لە نەهاتــە دەرێن مارەبابی حەیرانێ باردەکەن لۆ دەشتی هەولێـرێ*

ئەوجا دەمگۆتە حەیــرانێ وەرە با ئەمن و تووش دەستی یە ك بگرین لۆ دەشتەکەی شارەزووری بچینەوە چە مێ شلێـرێ*

حەیران٢٨٤

دۆرێ وەرتێ بە کانی و جۆگەو ڕووبارە*

بناری بەردە بووکی بواران بە دایم پڕ لەگەنج و لاو و کیژ و کارە*

وەکی زەینێ خۆم دەدایێ حەیرانێ منیان لەگەر دانەبوو لۆمەی من مەکەن هەرچی دەخۆم و دەخۆمەوە بە گەرووم تـارە*

حەیران٢٨٥

حەیران ئەتـوو لـەپێش چاو و دریمن گەلە جوانی*

ئەوی ئەمن بزانم ئەتوو نە کیژە شێخ و مەلای خۆ نە کیژێ پاشا و بەگلەرو میرانـی*

ئەدی لۆ ئەوەندە بەنازو عینوانی لەوان فێر بووی یان هەر بەخۆت ئەسلزادەو خانەدانی*

حەیران٢٨٦

لەسەرو سەران لەسەر کاریـزێ*

دوونێ سەر لە سبیانێ لـۆم دەهاتەوە جێی ژوانێ چاو ڕەشەکەی پڕ بە ئامێـزێ*

دەیگۆ کورە لاوە ئەتوو هەندە خەمان هەرمەگرە ئەگەر نەمدەنە توو لەخۆم حەرام دەکەم مارو مێرد لە توو بتـرازێ*

حەیران ٢٨٧

قەرەچوغ بە گەری گەری و هەرکەوە*

دەنگۆ بەچاوێ من بڕۆنە ڕەوەزە شاخان چەندە جوان پۆڕو خەردەڵ و سوسکە لێ دەفرن بە ڕەوە*

حەیرانێ خۆم دەچوێتم بەوان کەوو کۆترەکانی سەر لیسی ناوەڵا بەوان کارمامزەکانی لەلاتێ وەکی تازە چاویان چوویتە خەوە *

حەیران ٢٨٨

ئەوە ڕاوچیمە دەگەڕێم لە ڕەشەڕاوێ بەتاقی تەنێ*

حەیرانەکەی من کێروشکەکی چاو لەمەستەخەوە خۆی لەمن باردیە بزرمکردیە لەناو باغ و چیمەنــێ*

دەمگۆ کچێ بەگزادە ئەتـوو خۆ نێچیرێ خۆم بووی ئیمانێ دەبەی گەڵە بەتوو خرێتم دەوەرە با ئەو جارەش دەو باوێمە قۆرتێ گەردەنێ*

★ خرێتم: واتە تامەزرۆ یان پەرێشان.

حەیران ٢٨٩

حەیران لەئەشکەو سەقایــێ*

چاوو برۆت دەچوێتم بە مانگی دوو شەوی وەکی هەردێ لە بەینی مەغریب و عیشـایێ*

ئەوە سەرێ چەند سارانە کەتیمەوە غەریب و غوربەتان چبکەم هەرچەندی دەکەم سەبرو سێبوریم بەهیچ کەس نایێ*

حەیران٢٩٠

حەیران حەیرانە حەیـران سەنگینە*

ئەو بابان ئاوەدانە هەندە جوانە هەردەرێی کۆترەکانی باغی شاری سەربار نەخشینە*

دەرێن خۆشەویستیێ کیـژو کوڕی ئەو زەمانەی هەتا سەری نیە بەخوای ئیمن و ئەو بەژن باریك و ڕە شەسمەرەی هـەر بە مردنـۆکەو ژینە*

حەیران٢٩١

لە بناریێ سەفینی زەینێ خۆم دەداوە گردەخـڕەی*

ماریێ بابی حەیرانێ ئاوا دەبوون لە دەربەندی دەیانگرتەوە دۆریێ هەنارەی دەپەڕینەوە لە ئاوی بەستـۆڕەی *

دەرێن هەواریان گرتیە لـەهەرەت و باسکی زرارەتی بنەگەیان دادەنێن لە دۆری گردلانکێ بەرامبەری پەرپیتان و میرئاخوڕەی*

حەیران ٢٩٢

دەمەڕۆ مەڕۆ بابتگەمــێ هۆهۆ کیژۆرە هەمینێ*

لە دووری ئەو سەربەتاس و نیك بەکلیلەو کەمبەرەی هەموو هەناوم بوویەتەوە خەڵتانی خینــێ*

سەریێ چەند سارانە لەگـەر ئەوزالم داکەی یەکبووین ئەوسارەکە ڕەنج بەخەساریان کردین هەروەکی عەشقەکەی  کاکە مەم و خاتوونە زینێ*

حەیران٢٩٣

لەبان و بانان لـە بـانە شوانـێ*

بەژنی حەیرانێ دەچوێـنم بە شۆڕەبیەکانی دۆری هیران و بالیسانـێ*

لەبەر لۆمـەیێ عالەمـێ وخۆفی خودایێ گەورە نەبیتن دەبی لەپەنا داکی دەرینم هەر بە قرچـەی نیوڕانـێ*

حەیران٢٩٤

حـەیران لە دەشتـەدیانـێ*

سینگی ئەو بابان ویرانەی سپیە هەروەکی بەفری یەك شەوی وەکی تازە کەتیە لە کێلێ کیستانـێ*

ئەو کەم شەرت و بێبەقایە دەرێ بریتە حەیرانێ ئەمن بەمرازو مەخسودێ خۆم گەیشتم ئەویش بابمینێ لۆ ئاخ هەرینانـێ*

حەیران٢٩٥

لە بناری باواجی و ماوەتـێ*

کیژ دەرێ پاشی لاوێ نەرمۆکە لەخۆم حەرام دەکەم شایی و گۆوەندان بەخوای چ جاران ناچمە داوەتـــێ*

ئەوە سەرێ چەند سارانە مایمەوە لەبەینی بر او براژنان وا هیشکبوویمەوە لە ناو خەم و قەهر وخەفەتی*

حەیران٢٩٦

کێلەشین بەگورە نێرگزو مینازە*

بەژنی حەیرانێ توولە نەمامە لەبناری برادۆستی گەردەنی درێژە هەردەڕێی سۆنەو قورینگ و قازە*

کیژ دەیگۆ یان وەرە داخوازیم بکە لۆخۆت بمکە نۆبووکێ سارێ یانە یەکجاری دەستانم لێهەرگوازە*

حەیران ٢٩٧

حەیران بێریە دەهاتـە دەرێ لەبن قەرەتـاوری*

دەمگۆت زالم داك ئەتوو لە چاوو برۆیان بازو سەقەری لە گەردەنێ قورینگی لە ڕۆین و خۆبادانت هەردەڕێی تاوس و کـۆتـری*

دەوەرە با دەمەکێ پێکەوە لۆ سەبرو سێبوری دران دانیشین گەلە لەمێژە چاوەڕێمە خۆ ئەو دنیایە مەعلومە پێنج و دوو ڕۆژەکەو دێ و دەڕواو ڕادەبـری*

حەیران٢٩٨

سەد هەزارجـار خۆزگەم بە زەمانی جاحێری و دەوری کوڕینی*

وەکی کیژو کار لە چاردەورەم خڕدەبوونەوە دەیانگۆت کورە لاوە لۆ هەندە درگرو خین شیرینی*

ئەوجا میرێ کیژان زێدە لە هەموویان دەیگۆ لاوێ تەنکۆکە کەینێ دێیە داخوازیم ئەوجا پێکەوە بچینە قەیسەری و دوکانی هەولێرێ لۆم بەڕاداندەی تاقم و جلکێ بووکینـــی*

حەیران ٢٩٩

دەراوی قەشکە و سارتکەی لە من بە شینایی و بەراوە*

خۆزکەم بەوێ دەورو زەمانیکا وەکی حەیران بە گورگە لۆقە  دەڕۆیشت هەر دەتگۆت کارمامزە وەکی جارجارە ئاورەکی دەداوە*

محەلی ڕۆژئاوایێ بەیادی جاران دەچومەوە سەرکەلی قەشقەی ئەوی ڕۆژیم بەبیر دەهاتەو لۆیێ برینی کەونووونووم لیکرا کولاوە*

حەیران ٣٠٠

بریا تەیرەك باما لە ڕەوێ تەیران لەعاسمانێ*

وەکی مانگ دەهاتە چاردەی بچووبامایە سەر حەوشەی ماریێ بابی حەیرانێ*

چونکە گەلە لەمێژە چاوەڕێ و تامەزرۆمە ئەوجارە  بێترس و درەڕاوکێ پێکەوە تێر دانیشتباین لەزار هەیوانـــێ*

حەیران٣٠١

حە یران لە سە روسەران لە سەرێ سە فینی*

ئەوە سەری چەند سارانە خەموحەسرەتی  بێ دەولە تی کوردان لە دریمن دیت و خە تە ران دینی*

دە مگۆ هەرچی ناحەزە بەخاکونیشتیمانی کورد و کوردستان خوایە دەبا سیل و هەرەمی هەرینی*

حەیران ٣٠٢

حەیران لە سێقوچان و دەرماناوێ*

بەژنێ تووم گەلە باریك و میقات و ڕێکن هەردەرێی دارسنۆبەرە لە ڕەزو و باغی میراوەو سیساوێ*

سەرو چەفتە و گورینگت شۆڕبووینەوە وەختە بدەن لە پاشپانیان چ بۆمیەو دەرزیلەو قەزمە نووشتی پێنـاوێ*

حەیران٣٠٣

ئەوڕۆکە ڕێم دەکەتەوە جێژوانێ خۆم وحەیرانێ ئاوڕەکی گەلە بە غەریبیم لێدەداوە*

بەدەستە خۆم نەبوو ئـەوێ ڕۆژێم بەبیردەهاتەوە برینێ کەون و نووم هەموو لێکهەردەوەشـاوە*

چونکەحەیران گەلە حەسرزادە بوو جارەکێ دری نەشکاندم هەر بەخۆی زوڵف و شازوڵفانی لۆم هـەردەداوە*

حەیران٣٠٤

ئەورۆ بەوێ هێوارێ سەرم گەلە دێشی نازانم لۆئەوها خەوم نایێ*

دەمگۆ خەبەرەکم لۆبدەنە کیژۆرانی گوندی بێن لەکنم دانیشن مەرحەمەکم لۆ بگرنەوە وابزانم کەتیمە بە گرانەتایێ*

لە تاو دەردێ خۆم هوڕێتەم دەکرد وەمدەزانی ئەوە ڕاوچیمە لەگەر ڕاوچیێ گەردیان کێروشکەکمان هەردەستان لە بەینی بەحرکە و پیرزینی ڕستێ تاژیانمان بەر دەدایێ*

حەیران٣٠٥

حەیران لە گردیش و چەمرگەی*

بریا باجەستینـێ مـاچان بام یەکیان بواران لەبەینی لاجانۆك و بیرەجنـەی *
ئەویدیان پایزان لە ئاوێ مورتکەی سێیەمیان لەبنگەو بێرێ زستانە هەواری لە بەینی کاریتان و دیبەگەی*

حەیرانێ خۆم دەیگۆ هێتیمە لاوە مادام ئەوەندە تامەزرۆی لۆ جارەکێ سەرەکم لێنـادەی *
هەتا بەخۆم تامەزرۆت بشکێنم بەماچان یەکیان لەبرنـدایێ مەمکان یەك لە قۆرتێ گەردەنێ ئەویدیان لە بەینی لێوان و چەنەگـەی*

حەیران٣٠٦

ئەورۆ سبیانی لەگەر کزەی شەماری ئاورەکم لە باخچەکەی ناومـاران دەداوە*

نە دەنگی ناسکە بێریان دەهات نە چریکەی بولبول و تەیران نە بەژنێ باریك دەهات و دەچوو لەو نـاوە*

لەبەر لۆمەی عەبدان نـەبووایە لە هێرژنی گریانێم دەدا چونکە هەرچی برینی کەون و نووم هەبوو هەمووی لێکرا دەکولاوە*

حەیران ٣٠٧

حەیران حەیرانە حەیـران عەیشانە*

حەیرانەکەی من مل بە مـۆری و قەنەفرو مەرجان و گەردانـە*

لە دووری بەژنێ باریك و ئەو ڕەشەسمەرو بەژن درێژەکەی بە دریخۆم بەخوای ماریژگەم وێرانە*

## حەیران ٣٠٨

حەیران زۆزگ و هندرێن برندن حەسەن بەگ سەرلەبەفرێدا*

ئەوە ماری بابی حەیرانی بنەگچینە لە دەشتە دیانی بەهەنجەتی ڕاوێ زینم دەکرد جوانماینکەی  شینکی شیتاری سە رەکملێدا*

ئەوە حەیرانەکەی من لە پەنا پانکەی رەشماری بە قامکی بە ئەنگوستیلە لۆلەپی مەشکەی لە دەستبووگەلە بە خانوومانی نقری لێدەدا*

## حەیران ٣٠٩

دەمگۆ حەیران حەیرانە حەیران نازدارە *

سبیانەکی لۆخۆم سواردەبووم لە کەوێتەکی قاپ ڕەشی تـارە*

دەگەڕام بنگەو بێران هۆبە بە هۆبە لە دۆر و نەوران لە کلکە زووران لەناو چیغ و ڕەشماران هەتا حەیرانەکەی خۆم ببینم ئەوەی نەیدیتبی نازانی لێکدابڕان دەردەکی چەندە دژوارە*

## حەیران٣١٠

ئەوە بوارە دیسان هەور گەوار گەوارە*

ئەمن سەرێ چەند ڕۆژانە لە دووری ئەو ڕەشەسمەرەی درم گەلە سوارە*

دەمگۆ دەرێم  بەهەنجتی هەوارگرتنێ هـەوار بە هەوار  بگەڕێم بەشکم شەوەکێ دەبـمەوە مێوانی سۆرە گورەکەی چاوکارە*

حەیران٣١١

حەیران لە دەشت و بنار و کۆساران*

ناوەڵا لە بازاڕو قـەیسـەری و دوکانی شاران*

ئەمن چونکە بەخۆم نەمدیتیە نازانم نە جێڕاوگەو ژوان خۆشترن نە باوش و هامێزی کەونە دۆست و یـاران *

حەیران٣١٢

بەویّ سبیانیّ برینیّ کەون و نووم لیّ هەروەشاوە*

ئەویّ ڕۆژێم بەبیردەهاتەوە وەکی حەیران لەناو ڕەز و باغان شازولفانی هەردەداوە*

پاشی لێکدابڕانیّ حەیـرانیّ سەری دنیام لیّ وێکهاتیە تازە سەبر و سێبوری و ڕۆناکی مارم کوژاوە*

حەیران٣١٣

بەینی سابراغ و میرزاغەی لەمن بە برندو نەویـە*

حەیرانەکەی خۆم دەشوبهێنم بەپۆڕو سوسکەی دەوبەستی شەرغەی ناوەڵا بە کارمامزەکانی بناری باواجیە*

غەمیّ لە دریێمن گەلە زۆرن ئەنگۆ نازانن سەریّ چەند سارانە دووچاویّ بەرەکو گەردەنیّ زەردی بەخارو پەرچەم سۆری بەخەنەم بزرکردیە*

حەیران٣١٤

لە سەرێ زورگەزراوی زەینێ خۆم دەداوە قازیخانەو باشتەپەی خـدری*

بـەژنی ئەو زێدەجوانەی دەچوێتم بە توولە مێوەکانی دۆرێ ئالانەی وەکی تازە پەسیرەی دەگـری*

داخەکەی سەرێ چەند سارەی لە درێمن ئەوە حەیرانەکەی من دەبەن لۆمار و مێردان گەلە بە سەر گرانی و نابەدری*

حەیران ٣١٥

حەیران حەیرانە حەیران هاجـەرە*

ئەگەر ڕۆژی  دوو جاران لۆ من نایـیە بەرتاق وپەنجەران جارەکـێ وەرە*

ئەدی  ئەتوو نازانی قسـەو گفتو گۆت لە درێمن چەندە خۆش وخەم لابـەرە*

حەیران ٣١٦

بەژنی حەیرانێ برندو ڕێکە دەرێی داری سەرووە*

ڕوومەتی هەناری ئاژگەیە مەمکی سێوەکانی باغی شنۆیێ گەردەنی هەردەرێی زەردەلـووە*

بۆنی حەیرانەکەی من خـۆشترە لە بۆنی شەوبۆو سۆرە گوران ماچی لێوانی هەردەرێی قەیمـاغ و سەرتووە*

ناهەقم مەگرن وەکی دەرێم لەدووری ویە هەمووجەرگ و هەناوم ڕەشبـووە*

حەیران٣١٧

حەیران لە بنەسراوەو دارەتــووی*

لێو بەخەندەو پێکەنینی ڕفت و ڕۆینت تاوسیە لە بەژن و باراش میقات و ڕێکی هەردەمنی داری ســەرووی*

ئەدی ئەتوو دۆست و یاری من نەبووی سەرێ چەند سارانە وە بزانم لەبەر فەقیری و هەژاری و بێ یەغباری خۆم لۆمن نەبــووی*

حەیران ٣١٨

حەیران لە سێبـــەرو نســارێ*

قەولم دایتە ئەوناسك بەدەنەی ئەوسارەکە دەنێرمە داخوازی بەس بگەینەوە بــوارێ*

گۆتیتمە خزمان باروبووەکم لۆ بکەن بەشکم نەختی حەیرانێ تەواودەکەم ئەوجا مراز حاسردەبم بە حەراری لۆم دیتــە مارێ*

حەیران٣١٩

ئەوە سەرێ چەند سارانە ئەمن عاشقم عاشقی کیژۆرە جوانــێ*

ئەو غەداردائە وەکی سینگ و بەرۆکی لۆ واری دەکردم هەموو سەر لە سبەینان لە جێژاوگە و ژوانــێ*

هەر دەتگۆت پەنیری تەڕی زۆزانانە لۆیێ هەرچەندی دەکەم ئەو درە مارویرانەم لۆ گیرنابی بە دایم و سەعات دەکا جۆلانێ*

حەیران ٣٢٠

حەیران حەیرانە حەیران خڕێیە*

حەیرانەکەی من مامزە لە قوتکە قوتکێ مەخشومەو بانێێ قەیباشی ئاوێ دەخواتەوە لە چەوڵنگی پردێـیە*

پەرچەم سۆرێ بەخەنە چ لە مـارە بابان بی چ لە مارە خەزوران هەتا ئەو ڕۆژەی دەمرم درۆی ناکەم هەر چاوم لێیە*

حەیران٣٢١

بەژنی حەیرانێ من منارەو قەراتە*

کیژدەرێ والەبەرم دەکەن تاقمێ بوکینی بە نابەدری پاشی کوڕە لاوکێ خۆم ڕەبی لێم بەمارە میراتـە*

کورە حەیران ئەتوو خەمان هەرمەگرە هەموو نەورۆز و هەردوو جیژنان سێ ماچ لە کنەمن لۆتوو هەر دیاری و خەراتە*

حەیران٣٢٢

ئەوڕۆکە دریمن گەلە بـەژان و ژوورە*

بەژنی حەیرانێ من دەرێی دارتێلە ڕومەتی بەفرو خینە گەردەنی دەبراچێ هەر دەمنی کافـوورە*

ئەوە سەرێێ چەند مانگانە ئاگام لە عەمری دنیایێ نمایە چونکە ئەو ناو قەد بلورو چاو ڕەشەم گەلەك لێ دوورە*

حەیران٣٢٣

حەیران لە قەراتان لەقەراتێ کاولە مەخمـووری*

قەولمان لەگەر حەیرانێ وابوو ئەو بێتە کەنگرو کاردیان خۆی لە دەستەخوشکان داببڕی لۆم شۆڕبیتەوە دامەنێ زووری*

داخەکەم نەپرژام بیگەمێ لەجێی ژوانێ دەمگۆتەپێناوێ توخوا لەجیاتە من پێیبرێ دەبی ئەوجارە لە قسوریێم ببووری*

حەیران ٣٢٤

حەیران لە زارگەزەوی و خارخاران*

ژوانێ من و حەیرانێ کەتەوە دەوبەست و جۆم و کەنداران*

کیژ دەیگـۆ کوڕەلاوە کـــارو بەرخان بەردە قەرسیلە جۆیێ وەرە دەو باوێ قورتێ گەردەنێ بەکەیفی دریخۆت هەرمژە شەمامـەو خاران*

حەیران ٣٢٥

عالا و چەڵتوك و قەپران ئاقاریان لەسەر یەکـن*

بەژنی حەیرانێ داری چنارە ڕوومەتی ناسك وجوانی هەر دەمنی لوقم و کێکـن *

کیژ دەیگۆ ئەوڕۆکە درم زۆرخۆشە لەڕێیی سراوێ کیژو کار دەیانگۆت لەگەڕێی شایی بەژنت لەگەر حەیرانێ خۆت گەلە میقـات و ڕێکن*

حەیران ٣٢٦

کیژ دەرێ ئەمن گورم لەناو گورانیش سۆرە گـورم*

لاوێ ناو لاوان ڕەبی ڕۆژێ سەد جاران لەبەر سەرو سواری سەرخانەی زینی ماینێ حدودت مرم*

خوابکا بەنسیب یکبین شـەرتمکردیە هەرجارەکی هاتیەوە لە ڕاوشکارێ دەبی بەروەو پیرت بێم بەخۆم ڕستی جـەرەویت لۆبگـرم*

حەیران ٣٢٧

کیژ دەرێ کورە حەیران لۆ هەندە لەبەر دریمن خین شیرینی*

کوڕەتیمە لاوە خۆ ئەمن لۆتوو نەمایمە ئەدی لۆنایەپێش بەحەراری لۆ خۆتم بینی*

بمکەیە نۆبوکێ سـارێ بەوێ ساردەپایزێ لەناو دەواروهۆبەو ڕەشماران لانکێ ساوام پێڕابژینی*

حەیران ٣٢٨

کیژ دەیگۆت هەی لەخۆم بێیەغبـارێ*

ئەوە بوارە هەور زگی لە عەردی نایە گەوارە دەگرمێنی براچان دەدا باران وەکی لوولەی مەسینەی وأدیتە خـوارێ*
کوڕە لاوکەکەی من شوانە لە زووری گەزەنگان لەبەینی پەرکانەو سارەلووی دەترسێم خەوی لێکەتبی بەتاقی تەنێ لەبن کەنـدارێ*

حەیران٣٢٩

کوڕ دەرێ لەبەر تانەی بـەدکاران ناوێرم بچمە سەرکانیەکەی چارداغی *

کوڕو کار پێمدەرێن ئەتوو چ درت لەکنە مەنیە دایم و سەعات درسوارو قوراغـی*

چبکەم مارێ بابی حەیـرانێ چوینە بنگەو هەواری لەبناری دیدەوانی گەلە لەمێژە نازانم سەرو سۆراغی*

حەیران٣٣٠

دەو ڕووبارێ کاولان لەمن بە قوناوو چنە چنە*

پونگەو ڕەشەڕەحانان لێ دەچینم لۆ دەستی کەونە یاران هەتا دەبنە دەسکـەچنە*

کو دەزانم ئەمـن بەهەموو دەمان ئەوم لەبیرە ئەوهاش دەزانم ئەویش دری هەر لەکنە منە*

- ★ قوناو:واتە شوێنێکی ئاو لێبووی کەم کەمە بەواتایەکی تر واتە ئەو ئاوەی لەکۆتایی گۆل یان جۆگە ئاوەکە.
- ★ چنە چن:واتە کەم کەمە یان چۆڕە چۆڕە.

حەیران٣٣١

دەمگۆتە درێخۆم دەوەرە پێمبـرێ لۆ هەندە بەئێشی*

دەیگۆ ئەوە حەیرانێ دەغەمرێتن بە زەرد و سۆری بەوی ئێوارەی جومعەی چ دەسەراتیشم نیە بیگێڕمەوە خۆ لەپێش درێمن گەلە جوانترە لە کیژەکەی کافرۆشی*

دەمگۆ خوایە دەنا سەبەبکاری دوو دران تووشی دەردەکی ئەوتۆ بێتن عەردو عاسمان بەخۆی نەگریتن داودەرمان عیلاجی نەکا چ جێشی لە دەرێ نەبێشی*

حەیران٣٣٢

تـەڕوار تـەڕوارە *

بنارێ هەمزە بەگ و گردیشی قەدیم و زەمان  بە مامزو کارە*

چەندی دەنێرمە داخوازی حەیرانێ بەدرێخۆم داکی هەنـجەتـم پێدەگریتن دەرێ ناتدەمێ هێشتانەکە زووە کیژم مندارە*

حەیران ٣٣٣

حەیران لە بەحرکە وگردەچـاری*

دەمگۆتە حەیرانێ بابـان ئاوەدان بێچاوی بی بەژن و بارات ئەوەندە میقات و ڕێك و درێژە لەناو هەزار بە هەزاری دیاری*

چبکەم ئەو دایکەت دایتیـەوە عینادی ئەتووم ناداتێ چەندی شێخ و مەلا و سەیدان دەنێرمە کنی دەرێ دامنایە لۆ خوارزایێ خاری*

حەیران٣٣٤

حەیران لە سابراغ و میانـدواوێ*

دەمگۆتە حەیرانێ زولف وپەرچەمێ ڕەشت کەتینەوە سەر بژانگ و برۆیان چاوت دەرێی ئـەستێرەی گەلاوێژە پرشنگـان داوێ*

ئەمن شەرتم کردیە ئەگەر ئەتووم نەدەنێ کیژو کارێ گوندی هەموو وەکی خوشك و داکمە بەخوای لەپاشە توو قەت کەسم نـاوێ*

حەیران٣٣٥

ئەوە نەخۆشم  بە شەوان دەگرم شەوتایێ*

لەتاو ژان و ژووری قەلبم پێمخۆشە  دووسێ حەیرانان لۆ سێبورێ  دریخۆم برێم چبکەم دەنگم دەرنایــێ*

جوابەکم لۆبدەنە ئەوبەژن باریکو گەردەن زەردەی دەبا بەخۆی بێتەوە سەرینم بەشکم ئەوە خوایە لەبەر درێ وی لۆم بنێریتەوە شفایــێ*

حەیران٣٣٦

بەوێ عیشاێ گەلە نەخۆشم تایەکی گەرمــم لێیە درم خێرا لێـدەدا*

دەتوخوا بانگەکم لۆ ڕادێرن کابزانم داخوا ماخـــۆی چارچاو چ دەرمــان دەدا*

کیژۆرە جوان دەیگۆ دەرمانی لەکنە منە بەس دەستەکم بگاتێ چبکەم ئەو دایکەم گەلە حەکاکە هەرچەندی دەکەم مەجالــم نادا*

حەیران ٣٣٧

خەرابە و شەعەل ئەو دیو ئەو دیوی شێخ سمایـلی*

ئەو ناسك بەدەنە بە چ ئـەمنی کوشتیە بەخۆبادان و شلـوملی *

سەبەبکاری من و حەیرانــێ عەوارەی خوای بی ڕۆژباری قیامەتێ ئۆباری مەیان بـــەملی*

حەیران٣٣٨

دیسان غەمێ لێکدابرانێ هات و لە درێ من دیتو دەچێتن*

مارەبابی حەیرانێ باردەکەن دەچنە کێلێ کیستانێ نایتەوە هەتا هات و هەرزانی دیتن*

دەمگۆتە پێناوێ توخوا ئەو شەنگەبێریەم لۆ بینە جێراوگەو ژوانێ دواجارە دەبا چاوم پێی کەویـتن*

حەیران ٣٣٩

ئەوە نەخۆشم بەشەو دەگرم تایێ*

هەر چەندی کەلەکان وەردەگێرم بێ فایدەیەو خەوم نایێ*

دەمگۆتە پێناوێ گەلە بـاری سەلامان بکە لەو زالمداکەی پێموایە نایبینمەوە ئەوە خوایە بەشکم بەیەکدی بگەینەوە لەوێ دنیایێ*

حەیران٣٤٠

دەمگۆ کاکە هێمن توخوا ئـەتوو قەت مەنارە*

دەنگ و سەدای توو بەرزو برندە لە کوردستان بەقەد بەرزی قەرات و منـارە*

دە هەستەوە وەکی جاری جاران بەستەو حەیرانمان لۆ برێ لەسەرێ قەرەچوغ و زورگەزراوو سەفینی سەبرۆکە سەبرۆکە بەدەشتی هەولێریدا وەرە خـوارە*

حەیران ٣٤١

دەهەستەوە شێرە نوستیەکەی لەلانێ*

دەستت لەبناگوێتێ بەس ئەوەندە چاوە جوانەکانت لەسەر یەك دانێ*

بە هـەست و سۆزی جـوان و دەنگە خۆشەکەت وەکی جاران لۆم برێ دووسێ بەندە حەیرانێ*

★ ئەو دووحەیرانەم وەکو خۆشەویستی و وەفایەك بۆ کاکە هێمن سارمەمی دانایە چونکە حەیرانبێژێکی باش و ڕەسەنە نزیکەی (٨٥) حەیرانی منی گۆتیە لە ساڵی ٢٠١٤ و ٢٠١٥ و ٢٠١٩ (٣) کاسێت لە ٢٨/٨/ ٢٠٢١لە سەنتەری دڵ بوو.

حەیران٣٤٢

بناری کارۆخی لەمن بەگورە نێرگزو مینازە*

هاوارتە لەخۆمان ئەورۆکە قەراج و کەندێتاوەی ڕەنگین گەلە بێنازە*

کیژ دەیگۆ شۆڕەسوارەکەی بەدرێ خۆم بەس ئەوجارە بچینەوە کاولە مەفتەنێ دەبی لۆت بێمەوە جێڕاوگەو ژوانەکەی لە جاران ئەوجا بەکەیف و درێخۆت مرازان بخوازە*

حەیران٣٤٣

غەمێ لێکدابڕانێ ئەوەندە زۆرە چبکەم لەدرێ من دەرناچی*

دەنگۆ زەیندەنە باخچەکەی ناوماران چەند بێناز و چـۆلە چـونکە بەژنێ باریك لەناودا نایێ و ناچی *

ئای لەبەر دەردێ لێکدابـڕانێ من و حەیرانێ ئەوەندە گرانە هەرچەندی دەکەم و دەکەم خۆ لەبیرم ناچی*

حەیران٣٤٤

ئەوڕۆکە درێ من گەلە توندە هەر دەرێی گەمیم لی وەرگەڕایە*

هەرچەندی زەین دەمە باخچە ی ناوماران چونکە ئەو ناسك بەدەنەی تێدا نیە لۆ من دەرێی ناشی ئاو لێبڕایە*

دەمگۆ بەس ئەو جارە لۆم بێتەوە دەو باوێمە قۆرتێ گەردەنێ بەنۆرە ماچکەم قیتایێ هەردوو ڕوومەتی نایگۆڕمەوە بە تەختی بەگلەر و میر و پاشایە*

حەیران ٣٤٥

لە باغوباغان لە باغە جوانەکەی ئەوبەری*

هەرچەندی دەنێرمە داخوازی حەیرانێ چبکەم بەخۆشی نامدەنێ خۆم لێدەکەنەوە پشتگـــەری*

ئەوجا دەستی حەیرانێ دەگرم لۆ سولح و مەسرەتیان دەچمەوە دیوەخانەکەی ممتازحەیـدەری*

حەیران٣٤٦

دەمەڕۆ مەڕۆ با بتگەمێ هۆهۆ کیژە بارەکی*

ئەو لێو قەیتانە وەکی دیتەوە لە دەراوو کانیان ئەمنی کوشتیە بە ڕفت و ڕۆین و هەردوو چاوی بەرەکی*

دەمگۆ ئەو جارە بچمەوە قەیسەری و دوکانی هەولێری دەبی لۆی بکڕم گوارەو کرمۆکەو لاسەرە لەگەر جۆتە خرخارەکـی زێڕ لۆ ناسکێ بەلەکی*

حەیران٣٤٧

لە مێرگ و باغان لە باغی ساوا*

چاوو برۆی حەیرانێ دەچووێتم بەچاوی فەرەقەتێیەکانی دەشتی  قەراجێ بەژنێ باریکی بە قازە کەنگرەکانی  ناو وەردێی بەئاوە*

هەرچەندی کردم و کردم حەیرانەکەی خۆمیان نەدامێ لۆێی شەرتمان کردیە لەگەر حەیرانێ هەتا ڕۆژی مردنێ نە ئەو ببتە بوك نە ئەمنیش زاوا*

حەیران ٣٤٨

دارەکەی دیدەوان و شەکران و دارێ قەنتەران هەرسێك قەدیمە دارن*

ئەوانەی عاشق و ساحێب یارن بەدایم و سەعات لێو بەبارو درسوارن*

داخەکەی گرانم زۆربەیان بەقسەی ناحەزو بەدکاران مارداری کارێ ڕەنج بەخەسارن*

حەیران٣٤٩

پێش دەرکەی مارێ حەیرانێ بە گیافریزە*

ئەوە حەیرانەکەی منە دەڕوا لۆ ناوگەڕێ شایێ چەندەجوانی لێدێ قایش و کەمەربەند لەگەر دوگمە دۆراب و زریزە*

ئەمن چ بە خراپەیێ خۆم شکنایێ نازانم لۆ ئەوێ زالمێ زالمداك لەمن درگرو زیزە*

حەیران٣٥٠

حەیران لەدەو ڕووبـاریَ*

ئەو لێو قەیتانە لەپێش چاوو درێمن هەردەرێی حۆری وپەرییە لەحەفت تەبەقەی عاسمانان هاتیتە خواریَ*

دەمگۆ دەبێ خوابکا  ئەو ناسك بەدەنەم بدەنێ بە حەراری لۆخۆم پێنجشەم وجومعەکی بیکەمە نۆبوکێ ساریَ*

حەیران٣٥١

حەیران لە دۆرەبەکرەو هەمزەکـۆری*

بەژنێ باریك مامز بوو لەبناریَ زورگەزراوی شەولەوەڕی داوێشتەوە بەینی گردەشینەو عەلییە دۆری*

لەگەر هۆهۆی جۆتیاران هەردەستا لە نەرمەلانێ نەدەهاتە پارێزێ ڕووی خۆی دەداوە کەندارەسۆری*

حەیران ٣٥٢

ئەوە شایی و گۆوەندو هەرپەڕینە لەحەوشەی حەساریَ*

گەڵە خۆشدێ فیقەی زوڕناو نرکەی دۆریَ ئەوە حەیرانەکەی منە لەگەر چۆپی کێشانێ هەوری و هیزاری لەملان دەئـاریَ*

دەیگۆت لاوە بەخوای کڕوزەم لێوەدێ چبکەم ناوێرم  بێمە دەستت ڕەبی بەدکاری من و توو چاوی ڕەشکە و پێشکەی بکا سەراوسەر بکەویتەوە ناو چاریَ*

حەیران ۳٥۳

ئەورۆکە بەوێ سبیانێ نەمدەزانی ئەو درە کەسادەی من لۆ هەندە بەخەمە*

لەسەر گردەکەی شێراوەی چاوێ خۆم دەدا بانیێ قەیباشی چەولنگی پردێ دەورووباری چۆمەزەردەرەی  گرتیتی تەمە*

خۆ ئەمن ئەگەر ڕۆژێ جارەکێ ئەو بەژنباریك وچاوڕەشەی نەبینم لە بەرو بێرو کۆزو هاوێرێ هەروا دەزانم سارەکی تەواو لە عومرم کەمە*

حەیران ۳٥٤

غەمێ دنیایێ لە درێ بابێ هێدی و هێوری  دیت و بە هاتە هاتە*

کیژ دەیگۆ لاوی نەرمۆکەپێنج شەموو جومعەی دەمدەنە گولەکەی مێردان پاشی توو سەد جاران لێم بـە مارە میـراتە*

کیژ دەیگۆ کورە هێتیمە لاوە بەخوای بەس بێمەوە لۆ باوەخوندێ شەرتبی لۆت دێمەوە جێڕاوگەی جاران دوو ماچ لۆ توو هەر دیاری و خەراتە*

حەیران ٣٥٥

دیسان لە کەندیتاوەو گوندی شەناغەی شین و واوەیلاو گریانە*

توخوا کەینێ ڕەوایە لەسەر عەردو بان و ئاوی خۆت دەرتکەن بەزەقەی چاوانە*

داخەکەم کەسەك نەبوو دەست بگەینتە داری تەلەفۆنێ برێ بگەنە هاواری کاکە ئازادی جوانەمەرگ ئەوە بووە قوربانی لەسەر خاکی باب و باپیرانە*

★ تێبینی/ ئەو حەیرانە تایبەتە بە گوندی شەناغە کە زێدی خۆمە شەهید (ئازاد عارف)یش گەنجێکی قارەمانی گوندەکەمان بوو بەداخەوە لە ٢٠٢٢/٢/٢٢ بووە شەهیدی پیلانی بەعەرەبکردنی کەندیناوە و قەراج، واتا حەیرانەکە هەم سۆزە هەم کۆمەلایەتییە هەمیش نەتەوایەتی و فیداکاری خاك و ولاتە.٢٠٢٢/٢/٢٢

حەیران ٣٥٦

ئەو دەورەی نا دەوری خۆی ئاشی ئاوێ غەرابەو ئاشی قۆلی عەزەی

گەلە بەناوبـــوو*

دەچوومەوە سەر گردەکەی حەسەن گادەری مەزقەدەکەی شێ عەوڵای عەزەی چەندە جوان لەدوور دیاربـوو*

بەداخەوە سەرێ چەند سارانە بەدەستی ناحەزو بەدکارو بێخەمی خۆمان هەمووی تەخت و وێران بـــوو*

★ بیرۆکەی ئەو حەیرانەم لەمامۆستا مومتاز حەیدەری وەرگرت لەپەیوەندییەکی تەلەفۆنی لە بەرواری ٢/٢ /٢٠٢٢

حەیران ٣٥٧

دەوجا دەرێم حەیران ئەتوو پەرچەمت شێیە بسکت لووس و خاوە ڕۆینت مامزیـە*

خۆمن وەکی دێوەرەی قەراج و کەندێتاوەو دەشتی هەولێرێ و وراتی کۆیێ گەڕایمە لەگەر خۆشناوەتیـە*

چبکەم هەرچەندی دەکەم لەپێش چاوو دری من چ بەژن باریك و چاوبەزەکی وەکی توو جوانم لێ نەدیتیە*

حەیران٣٥٨

دەمگۆ حەیران لە گورگەو کەندارو سرێمان بەخشیـان*

ئەوە حەیرانەکەی منـە گەلە ماندیە لەسەر لاکەلەکەی دەڕوا لەگەر دەستە خوشکانی دیتەوە لەکەنگرو کاردیان *

بریا لۆخۆم خەرجەستینێ ماچان بام لەبەینی قەرەبۆتك و قەرەبێتکی لە کیژو کارێ شیخان و بامەندو مامەسێنیـان*

حەیران٣٥٩

دەمەڕۆ مەڕۆ بابتگەمێ هۆ هۆ خار لەگەردەنێ*

ئەتوو دەچوێتم بەوان کێروشکەکانی چاو لەمەستەخەو وەکی بەخۆم هەرمدەستاند لەناو قۆپەنێ*

ئەوە ئەمن دەچمە بنگەو بێرێ بناری قەرەچوغی هەواری ئۆرمزیارو سارمەمیان توخوا بەگزادە هەتا دێمەوە لۆ کەس مەچۆوە کەلەنێ*

حەیران٣٦٠

ئەنگۆ نازانن چاویان لەقەدو قامەت و برندی یارم کردیە دارئەسپیندارو چنارو سەروو*

هەر چەندی دەکەن نە بەقەدو قامەت وەکی بەژن و بارای حەیرانەکەی من ڕێکدەبن خۆ نە بە ڕەنگ و ڕوو*

دەوجا ئەنگۆش قەت لۆمەی درێ من مەکەن وەکی دەرێم شنگ و تاقەت و جوانکەیم هەموو لەسەر دوو چاوێ ڕەش وجـوانی چـوو*

حەیران٣٦١

لە بنارو بناران لە بنارێ تارینی*

حەیرانەکەی منیان دەدا سەربەهەوێ بەنابەدری پلکەپێناو دەیگۆ ئەلحانیش دەگرێی وەکی لەبن پانکەیێ ڕەشمارێ لانکێ دەژینی*

بە فێرێ ڕاوو شکارێ دەچوومە ناو هۆبەو هەواران وەکی هەستێ خۆم ڕادەگرت دەمگۆ وەڵڵا پێناو ڕاستەکا ئەوە خۆ لەگەر لایلایەی جارجارە ناوی من دینی*

حەیران٣٦٢

ئەوڕۆ گازدەکەم حەیران چەندم حەیرانی هەوایی پێدا هەرگۆتی*

وەکی دەهاتیەوە لەکەنگرو کاردیان لە زووری کەزنەزان و هەرەتی شەرەبۆت و شەرەبۆتی*

کچێ بابان کۆر ئەتوو درت لۆ هەندە ڕەقە لەڕاستە من نایییە ڕایێ هەر لەسەر عینادی و لاملی خۆتی*

حەیران٣٦٣

حەیران کیژۆرە عیسمەتێ*

خۆزگەم بەوێ دەورو زەمانی کا وەکی ئەمن شوان بووم ئەتووش لەگەر دەستە خوشکان دەچوویە ڕێواس و مازیان لە دەربەندی ڕایەتێ*

دەمگۆ پەرچەمەت دەچوێتم بەپەڵکێ گورە مەرجانی لە باغان ڕوومەتت بە بەفرو خینێ مەمکت بەوان نارج و لیمۆیەکانی وەکی عەتار دایدەنێن لەسەر سەبەتان لۆ جوانی و زەینەتێ *

حەیران٣٦٤

دەچمەوە کاولە شەناغەی لایەکم بەستی پەرکانەیە لایەکم کەندەباریکە*

ئەرێ براینە ئەگەر حەیرانەکەی من ناناسن ئەوە دایمە گەردەنی بە مۆری و مەرجانە ناوقەدی بە کلیلەو کەمبەرە ئەدی نەمدەگۆ زێدە لە کیژو کاران بەژنیشی گەلە باریکە*

خۆ ئەمن ئەگەر ڕۆژێ دوو جاران ئەوێ گەردەن بەخارو خەناوکە نەبینم بەخوای نوێژی نیوڕانێم لەکن تاریکە*

حەیران٣٦٥

کەندێ کۆدەرەی بە مێکوك و خڵتانە*

کیژی خەرکی ڕۆژ هەتا ئێوارێ لەبەر نەینۆکی دەکەن سۆراوو سپیاوێ حەیرانێ من هەر بە کاری خودای گەردەنی زەردە ڕوومەتی هەر دەرێی خورمەچیچانە *

چبکەم هەرچەندی دەکەم نامدەنێ لۆێ ڕۆژ هەتا ئێوارێ لە کوچەی شاران دەگەڕێم بوویمەوە شێتەکانی دەل و دێوانە*

حەیران ٣٦٦

دووگوندی گەلە خۆش و درگرن یەکیان چل هەویژە ئەویدیان سەید عوبێـدە*

کەتمەوە دەشتی کـەندیتاوەی ڕەنگین داخەکەی گرانم ئەوە سەری چەند سارانە سەر لەخەمـێـدا*

کیژ جواب لەسەر جوابان دەنێری دەرێ هێتیمە لاوە گەلە لەمێژە چاوەڕێمە توخوا دەورە سەرە کم لێدە*

حەیران ٣٦٧

بیرەکەی شیرناوێ سەید عوبێدی قانات برنـدە*

لەپێش چاوو درێمـــن زێدە لە کیژو کارێ گوندی حەیرانەکەی من گەلە عەرێمگران و ڕەنـــدە*

دونێ بەدرەنگەوە دەهاتەوە لە کەنگرو کاردیان لە کەندو لەندێ کـەلباوێ دەیگۆ کورە حەیران ئەتوو چەند ئەمنت خۆشدەوێ بەخوای ئەمنیش دووسەد ئەوەنـدە*

★ بیرۆکەی ئەو حەیرانەم لە کاك هەژار نانەکەلی وەرگرت .

حەیران ٣٦٨

ناودارۆکان لەمن بە دارئەسپینـدارە*

دەنگۆ بەچاوێمن زەیندەنێ ئەوە کیژو کاری سولاوکو بێرۆکان دێتەوە لەدەراوو کانیان بەژنێ باریکیان لەگەرە خۆ لەناو هەموویان ڕا دیارە*

ئەوە بەژنێ باریك سواردەکەن لەخانەی زینی دەیبەن لۆ گولەکەیێ مێردان ئۆمەرمەندان ئەتوو گەلە دووری دەستم ناتگاتێ جوابەکم لۆ بدەنە براو برازاو خوارزایان و خزمان بمگەنە هـــاوارە *

حەیران٣٦٩

هەولێر هەولێرە*

بەژنـی حەیـرانە جوانەکەی من هەندە ڕێك وجوانە هەردەمنی داری کنێـرە*

دەمگۆتە ئەو زێــدەجوانەی دەزانم ناتوانی بێیەوە جێژوانەکەی لەجاران توخوا نامەکم بەدەست وخەتە جوانەکەی خۆت بەپلکە پێناوێدا لۆ بنێـرە*

حەیران ٣٧٠

ئەوڕۆ لەبەر عاجزیێ دریخۆم دەمەکێ دەچوومەوە سەر زوورگەزراوی*
ئەوجا ڕووێ خۆم دەداوە قەرەچوغی سەبرۆکە سەبرۆکە دارێ دووربینێم دەداوە بەرچـاوی*

دەمگۆ قەرچوغ دەتوو دەمەکێ سەرێ خۆتم لۆ نەوی بکە بەشکم هۆبەو هەواری مەرزانان بەدیار دەکەوی وەکی هەموو کێشتانان حەیرانە کەی من هەوێژێ دەماری دەبا تێرببینم دوو چاوێ ڕەش و پەرچەمـێ خـاوی*

حەیران ٣٧١

حەیران لەکەندان لەکەندێ شیـوەسۆرێ*

ئەوە کۆمەرەکێ سواران لەپێش دیوانێ دەچنە قۆنگرەو قۆشەنێ کەتنەوە ساکەگـــۆڕێ*

کیژ دەرێ خوام بەقوربانی سوارێ بەرایێ کا ئەوە شلیکردیتەوە ڕستێ جەرەوێ گرتیتیەوە بەرایێ سواران هەی ڕوحم لە دەورتگەڕێ*

حەیران ٣٧٢

دەوجا دەرێم ئەوە بوارەکی گەلە شینــە*

ئەوە کۆمەرەکێ قازو قورینگان هاتنەوە لەکێلێ کیستانان وەکی زەینم دەدایێ
حەیرانەکەی منیان لەگەردا نینە*

بەسەرم دادەهات خەموو تاری تایەکم دەهاتێ لەحەژمەتان لەمن دەکولاتەوە هەرچی
کەونە برینــە*

حەیران ٣٧٣

دەمگۆ خۆزی بە خۆزیدارێ دنیایێ*

لۆخۆم لەتاقێ عاسمانان پەلە هەورەك بوومایێ*

وەکی حەیرانەجوانەکەی من دەچووە پەرێزە جۆیێ سیێبەرم لێدەکرد نەوەك
ڕوومەتەکانی سۆری گورگوری پوت ببن لەبەر قرچەی گەرمایــێ*

حەیران ٣٧٤

نازانم نەلەحەژمەتی حەیرانێیە نە لە تاو غەریبیێ خۆمــە*

ئەوە کەتیمە ناو جێوو باڵینگانێ تایەکی گەلە گەرمم لێیە وەبزانم سێبەڕۆمە*

کیژ دەیگۆ توخوا هێتمە لاوە ئەتوو خەمان لەسەرە من هەرمەگرە بەخوای هەتا
ئەتوم هەبی ئەمن هەر لەسەر قەول و قەرارێ جارانی خۆمە*

حەیران ۳۷۵

حەیران عەزەو قونیان و دووستەپە چاردەورەیان بەڕاکە*

ئەوە حەیرانەکەی منە لەناو کۆزو هاوێری خۆی دەلەنگێنی لێك هەرداوێری زاك و ماکە*

ئەنگۆ بەس ئەمن بگێڕن لەکن دختۆرو تەبیب و شێخ و مەلایان پەنجەیێ نەرمۆکەی ئەوێ شەنگەبێریم نەگاتێ بەخوای نەداوو دەرمان نەنوشتەو کشتەك چارەی دەردی من ناکا*

حەیران ۳۷٦

ئەوڕۆکە شارەکەی هەولێرێ لەمن بزر  بووە لە تەم و توماتێ*

خۆ ئەمن برینێ چەند سارانم لێ دەکولێتەوە  کاکینە وەکی دەگەمەوە جێژنەی قوربانـــێ*

ئەرێ براینە ناوی ڕۆژی یەکی شوباتێی شارەکەی هەولێرێ لێنایە ڕۆژی پشتشکان و جەرگسووتان و لێکدابڕانێ*

حەیران ۳۷۷

لە گەلی و گەلیان لە گەلیــێ شەمــان*

دەمکۆ خۆزی بەخۆزیداران لۆخۆم باغەوانەك باما لەناو ڕەزو باغ و مێرگو چەمـــان*

وەکی حەیرانەکەی من هەموو دانی هێواران دەهاتە سێبەرو نساران پێکەوە بمانکردایە سوحبەت و گەمان*

حەیران ۳۷۸

حەیران حەیرانە حەیران نازدارە*

گراویەکەی من سوکە ژنەکی دەست بەبازن و ناوقەدباریکە لە ڕفت و ڕۆینێ گەلە بەلەنجـەو لارە*

ئەوە لەوێ ڕۆژێوە ئەو بەژنباریك و دەست بەبازنەم لێدابڕایە بەخوای دایمە لاکەلەکەکم بەتـارە*

حەیران ۳۷۹

ئەوە دیسان خەمێ دنیایێ هات و لەدرێ من دەکاتن تـۆزێ*

بەدەستە خۆم نیە برینێ کەون و نووم لێ دەکولێتەوە وەکی هەموو سەرەساران دەگەمەوە نـــەورۆزێ*

چونکە چەندی چاوێ خۆم دەگێڕم لەناو کیژو کاران شۆڕەژنان دوو چاوێ ڕەش نابینم پێکەوە بکەینەوە جێژنانە هەرلەگـەر پیـرۆزێ*

حەیران ۳۸۰

بەینی خەرابەو سەگەڕان و گورگەی بە نەور و دۆرە*

ئەنگۆ قەت مەرێتە من خۆ داکی کراس ڕەشان نەبڕایە ئەتوو ئەوها کەسەرداری ئەوە کیژو کار لە گوندێ مە گەلـەکی زۆرە*

دەمگۆ ئەنگۆ وەکی من نازانن ئەوێ سەرشینێ سەربەتارێ  شەنگەبێریەکی چەندە عەرێمگرانە وەکی خۆی دەلەنگێنی هەردەرێی بەردیلەکانی دامەن شۆڕە *

حەیران ٣٨١

دەمگۆ گەلە بریندارم لە برینۆکانم خەلاس نابن چۆڕاوگەی خینێ*

دەنگۆ جوابە کم لۆ بدەنە داکێ حەیرانێ دەبا لێگەڕێ حەیرانە گچکەلانە دەمەکێم بێتەوە سەرینێ*

بەخوای گەلە مەترسیان دەکەم لەسەر درم ببتە کولك و دیدار حەزرەت سەربنێمەوەو بمرم بەوێ کەونە برینێ*

حەیران٣٨٢

دەمەڕۆ مەڕۆ با بتگەمێ کیژۆرە نارینێ ئەدی نارێم گەردەنت قەندی هۆلەندی*

بەژنێ توو دەشوبهێنم بەداری سەندەلێ لێوت بەپەلکی سۆرەگورێ بۆنت بە شترە شەوبۆیەکانی کانی دەربەندی*

دەمگۆ بەس خوابکا ئەو قات و قڕیە نەمینێ دەبی بتبەمە دۆری کاولە شاورێ وراتی مەرگەو پشدەرێ ئەتوو بە بوکینی ئەمنیش بە زاوابەندی*

حەیران ٣٨٣

ئەوە کیژ دەیگۆ دایە ئەمن شەرتمکردیە نەدەچمە داوەت و دیلانێ*

نە زولفان دەنێم لەخەنێ نە سینگ و بەرۆکان دەڕشێنم بە گوراوێ نە لەدەستدەگرم سۆرەگورو ڕەشەڕەیحانێ*

هەتا ئەوێ ڕۆژێ کوڕە لاوکەکەی من قوتاری نەبی لە حوکمێ حاکم و بێبەختان نێتەوە لە حەپس و زیندانێ*

حەیران ٣٨٤

ئەوە کوڕ دەرێ ئەمن تەیرم لە تەیران تەیرەکی شینم*

ئەوها مرودەی حەیرانێ نەبوویمە خۆشبیتەوە پێموایە دممرم ئەگەر ڕۆژێ جارەکێ دوور بە دووری نەیبینـم *

دەمگۆ حەیران خۆ ئەمن نەخۆشی توومە توخوا بەهەر هەنجەتەکی بی ڕۆژێ دوو جاران نەبی جارەکێ هەر وەرە سەرینم*

حەیران ٣٨٥

مەڕۆ با تێر بەژن و بارای برندت ببینم هۆهۆ کیژۆرە شێخانی*

کچێ شەنگ و شۆڕ ئەتوو هێشتان نازانی لپێش چاوو درێ من چەندە ناسك و جوانـــی*

هەرچی سەبەبکارێ دوو درانە خێرو خۆشی دنیایێ لە خۆی نەبینی لۆ خاتری پیری ولیان شێخ عەبدولقادری مار لە بەغدایێ و پێغەمبەرەکەی ئاخری زەمـانی*

حەیران ٣٨٦

لە سەرێ بێژینگبەسەری زەینێ خۆم دەداوە گەرێ سەنگەران*

حەیفەك و دوازدە مخابنێ دنیایێ دیسان لە بناری قەرەچوغی گریانی ژن و منداری ساوایە لەگەر نارەنارێ بریندارا ن*

دەمگۆتە بابێ سەرۆکێ کوردان فـەرمانەکی بدە کوڕە کوڕێ کوردان بادەستدەنە ڕەشاش برێن و قازیفان دەرێن فەرمانە لەکەندێتاوەو دەشتی گورزەیی دەبا بگەنە هاواری قەرەسالم و خدرجیجەو لهێبان*

حەیران ٣٨٧

خۆزیا بەخۆزیداران کۆترەکی زاجل بوومایـــە*

لۆخۆم ساریّ دوو جاران لە شەقەی بارمدابا لەتاقی ئاسمانیّ لەمەدینەی منەوەرە بنیشتا بوومایـە*

ئەوجا ڕۆژ هەتا ئێواریّ هەر پێنج فەرزە نوێژەکانم لەمەقامی ڕەوزەییّ موتەهـەرەی پێغەمبەری نازدار بکردابایە*

حەیران ٣٨٨

ئەوڕۆ دەمگۆ حەیران قـەت نـەمدەزانی دەردی پیری ئەوها کوڕم دەکاتەوە*

هەردەرێی تەیری لابار  شکامە ماروێران لە ڕێوبانان دەڕۆم هەرچی دێو قوتە ئاوڕەکم لێدەداتـــەوە*

دەبی بگەمەوە  ئەویّ دەورو زەمانی شەوی بواران تێکبئارێن لەگەر حەیرانی هەتا مەلابانگدان لێکمان دەکاتەوە*

حەیران ٣٨٩

بەژنی حەیرانیّ شترە نەمامە وا تازە دەردەکاتن هوردە پەلکە*

حەیرانەکەی خۆم دەچوێتم بەوان چوشتیرە مامزەکانی قەدپارو گردو ڕەوەزە شاخان وەکی پێشی ڕۆژئاواییّ دەگەڕیّ لاتێخوی چادەکا*

گەلە لەمێژە تامەزرۆی دوو چاویّ ڕەشی بێکلم خۆ نەمدەزانی ناحەزو بەدکار لەپێشمان دەبنەوە هـەورازو ڕکە *

حەیران ٣٩٠

دەمگۆ بەینی ڕانیەو قەراتەدزێ کێوەڕەشــە*

ئەوە سەرێ چەندی چەند سارانە ئەو درە کەسادو مارویرانەی من چاوەڕێی هەوکەکی  زەردو دوو چاوێ ڕەشــە*

ئەگەر خۆشەویستیێ عالەمێ لەبەر جوانی و تەماحێ مارێ دنیایێ بیتــن ئیمن و حەیرانێ پڕ بەدرێخۆم خوادەزانی بێغەل و غــەشە*

حەیران ٣٩١

کەتمەوە  شارەکەی کۆیێ لەمن بە قەیسەری و بازاڕو دوکانە*

قەدیم و زەمان دەرێــن جێــی نووسەرو شاعیرو گەورە کابان و پیاوی عەگید و ماقوڵ و خانەدانـــــە*

ئای برام لەبەر ئەوێ دەورو زەمانی وەکی حەماغەی کۆیێ دەیگرتەوە سەرێ مەجریسێ چەند خۆشبوو گەورەو گچکەیی و قەدرگرانی ئەوێ دەمانە*

حەیران ٣٩٢

لەپێش درێ من شارەکەی ڕواندزێ گەلە درگرو جوانە*

ئای لەوێ دەوری کەوی وەکی پاشای کۆرە لێی دادەنا تۆپ و تۆپخانە*

ئەوە سەرێ چەند سارانە ئەو کوردە ڕەشو ڕووتە دەکوژرێ و دەبڕێ بەدەستی دوژمنان داخەکەم هەر نەگەیشتینە ئەو ڕۆژەی عەلەمێ کوردستانێ هەردەین لەسەر حەمرینی خۆمانە*

حەیران ٣٩٣

حەیران لەپیرینگەو مێرخوزاریێ*

بەژنی حەیرانێ من نەکورتـــە نەهەندە برندە میقات و ڕێکە چبکەم هەرچەندی دەکەم نامدەنێ ئەوسارەکە بەوێ بواریێ*

دەوجا دەرێم خوایە هەرچی باعیزێ دوو درانە لەسەر کەپرەکی دار خەوی لێکەتبی لەگەر لرفەی ئاگری بەخەبەر بێ سەری لێ بشێـوێ سەراو سەر بکەویتە خـواریێ*

حەیران ٣٩٤

بناری قەرەچوغی بەهەرکەوو باسك و تەلانە*

کیژ دەیگۆ ئەوڕۆکە درم زۆر خۆشە کوڕەتیمە حەیرانەکەی بەدرێ خۆمم لێ مێوانـــە*

دەمن شەرتم کردیە دەبی بینوێنم لەسەر شەمامە و بەندان هەتا مەلای سبیانێ دێتە بانگدانـە*

حەیران ٣٩٥

ئەوڕۆکە لەبەر غەمێ حیزە دنیایێ درێمن گەلە تونـدە*

خۆحەیرانەکەی من سوکە ژنەکی دەست بەبازنی پێ بەخرخاری گەلە جوان و ژیکەلەو ڕەنـدە*

ئەوجا جوانەکەی بێپەرە دەیگۆ کورە لاوە توخوا ئەتوو خەمێ مەخۆ ئەتوو چەندت ئەمن خۆشـدەوێ بەخوای ئەمنیش دووسەت ئەوەندە*

حەیران ٣٩٦

لەسەرو سەران لەسەرکارێـزێ*

دونێ لۆم دەهاتـەوە جێـڕاوگەو ژوانێ چاوڕەشەکەی پڕ بەئامێـزێ*

دەیگۆ لاوێ ڕەشتارە ئەتـوو چ خەمان هەرمەگرە  هەتا هەناسەم لەسەر دنیایێ مابی
لەخۆم حەرام دەکەم مارو مێرد بە خوای لەتوو بترازێ*

حەیران ٣٩٧

هەرەتی سەربەشاخ و جاستان و تیکاڵۆی لەمن بە مامزو کارە*

ئەگەر حەیرانەکەی مـن ناناسن دایمە لاتەریکە لەناو کیژۆران تیلاکەی خـوارە*

دونێ بەپلکەپێناوێ جوابی لۆ هەناردیمە دەرێ  بێ وبمگاتێ  دەنا بەزەبری
خەنجەرێ لە گولەکەی مێردانم مارەدەکەن هەی لەخۆمان بێیەغبارە*

حەیران ٣٩٨

خۆزگە بەخۆزیداران کیشوەرەك هەبووایە لۆ ماری خۆشەویستی*

هەتا هەرچی عاشق و دربـریندارە بێترس و درەڕاوکێ بەکەیفی درێخۆی لەناودا بێوو
بچی*

 توخوا ناحەقم مەگرن وەکی دەرێم ئەوەی باعیزی دوو درانە ڕەبی قەت بۆنی
بەهەشتێشی لۆنەچی*

حەیران ٣٩٩

حەیران چەندم پێداهەرگۆتی لەسەروچاوێ*

بەژنت برندە چاوانت ڕەشکۆکەنە گەردەنت زەردە لێوانت لەخۆڕا سۆرن چ دەرمانی پێنـاوێ*

خۆزگەم بەزەمانی کوڕینی وەکی شوان بووم دەهاتمەوە لە شەوینێ حەیران بەرەوپیلم دەهات دەیگۆ هێتیمە لاوە گەلە ماندی و مردی دەکە کۆرایم دایێ*

حەیران ٤٠٠

خۆ ئەمن پیر نەبووم خەمێ حیزە دنیایێ پیرو خەڕۆیانکردم*

لە خۆشی و تامولەزەتی کۆڕی لاوکو حەیران و مەجریس و دیوەخانانی کردم*

بەخوای پێموایە هۆنە هۆنە نایەمەوە قەیدوقامەتی جاران هاوارتە لە خۆم

تازە ڕابردم*

حەیران ٤٠١

لە دۆران لە دۆرێ هەرشۆیـان*

وەکی حەیرانەکەی من دیتەوە لە دەراوو کانیان نازانم نەزەین دەمە زەندێ سپی بەبازنی دەست و جەڕەی نەجوانییێ چاوو برۆیـان*

شەرتمکردیـە ئەگەر بمدەنێ دەبی کەپرەکی لۆبکەم لەبناری بەردەبووکی

هەرچاردەوری بکەمە شترە نەمام هەتا لەسەری بگری نارنجێ لە بنیشی بگریتن

زەردە لیمۆیـان*

حەیران ٤٠٢

حەیران حەیرانە حەیران زیلانە*

دەنگۆ زەیندەنێ وەکی دیتەوە لە کۆرو کانێیێ بایێ هوڕەی لادەدا بسك و شابسکان گەردەنی زەردی بەدیار دەیەخی چەندە جوانە*

ئەگەر ڕۆژێ جارەکێ حەیرانەکەی خۆم نەبینم بە لەنجەو خۆبادانی لەناو باخچەو ڕەزان بەخوای ماریژگەم ویرانە*

حەیران ٤٠٣

حەیران لەبانی و بانیان لەبانێ سمیلانێ*

ئەوە حەیران ماریخۆی لەگەرکردم پاریخۆی دایتەوە گۆڕو گۆڕخانێ*

ئەمنیش بەتاقی تەنێ مایمەوە لەکاولە خانیان لۆخەم و تاری و ئاخ هەرکێشانێ*

حەیران ٤٠٤

حەیران لە قەسرو ماکۆسانێ*

حەیران مامز بوو هەرم دەستاند لەناو پاوانێ درم نەدەهات بیگرم

بەسەردەکەت لۆ بانەشوانێ*

گەلی براینە ئەوەی نەیدیتبی نازانی دەردەکی چەندە گرانە دەردێ دووری و غەریبی و لێکدابڕانێ*

حەیران ٤٠٥

حەیران لەگردو گردان لەگردخەبەری*

ئەوە حەیرانەکەی منە دیتــەوە لەگۆمێ شیرناوێ کراسی لەبەری جورجێتی تەورێزیە چەندە قیت و جوانە فۆتە ئەنگۆرەکەی لەسەری *

نازانم نە لە تاڵحێ منە نە لەبەختێ کچەتیم حەیرانێیە هــەرچی دەرارو موشتەری هەیــە لە حەیرانەکەی من  بووینەوە کڕیارو موشتەری*

حەیران ٤٠٦

لە بناری خارخاراُن زەینێ خۆم دەداوە گردجادری*

خۆزگەم بەوێ دەورو زەمانیکا وەکی میر کوڕ بووم لەگەڕێ شایێ و فیقەی زوڕنایێ دوو دۆ لەدەستم هەردەپەڕی*

ئەلحانەکە پیربوویمە هاوارتە لەخۆم و دەردێ مردنێ هەرچەندی تانان لەخۆم دەدەم نەپشتم قیتدەبتەوە چبکەمێ نەچۆکم عەردی دەگری*

حەیران ٤٠٧

نازانم نە لە حەژمەتی حەیرانێیە نە لەتاو غەریبیێ خۆمە*

ئەوە کەتیمە ناو جێوو باڵینگانێ تایەکی گەلە گەرمم لێیە وەبزانم سێبەڕۆمە*

کیژدەیگۆ توخوا هێتمە لاوە ئەتوو خەمان لەسەرە من هەرمەگرە بەخوای هەتا ئەتوم هەبی ئەمن هەر لەسەر قەول و قەرارێ خۆمە*

حەیران ٤٠٨

ئەوە زستان بەسەرچوو ئەوجا ئادارو نەورۆز دێتەوە*

چبکەم بەدەستە خۆم نیە وەکی زمردو کەسك و سۆران دەبینم تێکەر بووینە لە دۆرو نەوران حەیرانەکەی منیان لەگەردانیە برینێ کەونوم لێ دەکولێتەوە*

دەوجا دەمگۆتە پیاو چاکان مەلای دوازدە عیلمی مزگەفتان مامڵێ جولەکان قەشەیێ دیانان بەدر لۆم بپاڕێتەوە لەباری تەعالا حەیرانە جوانەکەم نەخۆشە ئەوجارە لۆم چاکبیتەوە*

حەیران ٤٠٩

لەبانیێ قەیباشی زەینێخۆم دەداوە چەولنگی پردێ*

هەموو سبەینان و ئێواران دەنگی شالولو بولبوڵان لەدەراوێ لە گوێی من گەلە خۆشدێ*

دەرین سبەینێ کەیف و سەیران و شایی و هەرپەڕینە توخوا زێدە جوان کەم کەمە وەرە دەستم نەوەکو ناحەزو بەدکار حەسوودیان پێبێ *

حەیران ٤١٠

زەوییێ بەرماران بەگەنمە خێڵۆکە*

دەرێن پێنج شەموو جومعەی شایی و گۆوەندە بە دۆرو زوڕنای دەمگۆتە حەیرانێ توخوا تاقمەکی کوردی گەڵە جوان لەبەرە خۆتکە*

ئەوجا بەشاییێ دۆستان بەکوراییێ دوژمنان وەرە دەستم ئەمن بە ڕانکوچۆغەری کری زاخۆیی ئەتووش کراوو دەسرۆك و هەورییەکی سرکەیی تەورێزی لەملە خۆتکە*

حەیران ٤١١

ئەورۆ سەرباری هەموو غەمێ دنیایێ لە دریمن تێکدەچرژێتن*

دەمگۆ چ دختۆرو حەکیم ولوقمانانم پێناوێ وەبزانم هەر ئەوێ دەمێ شفام لۆدێتـــن*

بەس لێگەڕێن حەیرانە جوانەکەی پڕ بەدرێخۆم بەڕووەکی خۆش و دەو بەپێکەنین خۆی هەرشەقینی و بەروەو ڕووم بێتن*

حەیران ٤١٢

حەیران حەیرانـە حەیران کۆتـرە*

بەژنی حەیرانێ من داری سـەروە بۆنی گەردەنێی هەردەرێی قەنەفـرە*

کیژدەرێ بەس ئەوەندە بـەبەژن و بارایێ مندا هەربرێ یان وەرە پێش بەمەردی بمخوازە یان ئەوەتە چاوانم لەسەر هەرگـرە*

حەیران ٤١٣

حەیران حەیرانە حەیران سۆرگورە*

هەرچەندی دەگەڕێم لەشاران لە زە ری و ئە سمە ران بێفایدەیە هەر حەیرانەکەی خۆمم بـەدرە*

بەس بابت با ئەتـووم بەحەراری بداتێ شەرتمکردیە دەتبەمە ناو قەیسەری هەولێرێ بەکەیفی درێخۆت تاقمێ بوکینی و زێڕو زێدەباریان هەرگرە*

حەیران٤١٤

دەمگۆ ئەو دەورەی نا دەوری خۆی بەپەرێزەجۆیێ*

ئەوە حەیرانەکەی من چەندە جوانە دەست و قەرانگی وەکی لەدوو سەپان و پاران هەردەگرتەوە مەرۆیێ*

خۆزی بەخۆزیداران جۆتـەکێ ڕاموسانم قەردبووایە یەکیان لەبن شۆڕابەی گواڕێ ئەویدیان لە قولینچکێ برۆیێ*

حەیران ٤١٥

ئەمن نازانم درێ مـن لۆ هەندە بە کولوکەوە*

ئەوە شاییەك دەگەڕێ لەسەر جۆخینان شەوەکەشی مانگەشەوە*

کیژدەرێ کورە حەیران لـەدرەنگی شەوێ وەکی شایی بەردرا دێمەوە کۆڕانی تەنگ بەبریق و باقی کلیلەی سنجاقان بمناسەوە*

حەیران٤١٦

حەیران لەتاریکە شەوێ*

دەرێن ئەوشۆ شـەوی یەڵدایە هەرچەنذی کەلەکان وەردەگێڕم

چبکەم چاوانم ناچیتە خەوێ*

دەمەکێ دەبۆرژام حەیرانم دەهاتە خەونێ هامێزی لێدەدام بەزارەکی پر شەکر دەیگۆ لاوێ بەدرێخۆم بەلس پێمبرێ چتدەوێ*

حەیران ٤١٧

ئەوە بەخۆم شوانم شـوانـێ بزن و نێرییان *

حەیرانیش بێریە لەناو کـۆزو هاوێرێ دەیگۆ سبەینێ لەگەر دەستە خوشکان دەچینە ڕێواس و مازییـان*

قەولی دایمێ لۆم دابڕێ لە دەستە خوشکانی ئەوجا لەسەر کانی و دەراوان دەستی باوێمە سەرشان و شازولف و کەزیـیـان*

حەیران ٤١٨

دەمەڕۆ مەڕۆ بابتکەمێ هۆهۆ کیژۆرە ئامینێ*

قەولمان وایە ئەگـەر هات و هەرزانی بی جۆخین هەرگران بتگوازمەوە سەرێ پایز و کۆتایی هاوینێ*

ئەوجا کەپرەکت لۆ دەکەم لەبەینی سکتان و هیرانێ داری لە دارقەزوانی بی قەدی لە ڕەشەڕەیحانی بی سەری لەپەلکی گوری بی ناوی لە قورەسۆرێ بی ئەوجا مردن حەقەو ناحەق نیە هەنگینێ*

حەیران ٤١٩

حەیران لە گردەڕشـەو قەرەچناغەی*

مارئاوەدان ئەتو لۆ ئەوەندە جوانی هەردەمنی کیژە توجاڕو بەگزادەی*

حەیرانەکەی من مامز بوو دەلەوەڕا لەئاقاری گردمەلای هەموو هێواران ئاوا دەبوو لە ڕێێ پارێزم لێدەستان لۆخۆمم دەگرت لە جۆگەو دەراوێ مورتـکەی*

حەیران ٤٢٠

حەیران لە داران بەخـۆم لە ڕاوێ*

یارەکەی من کارمامزەکی سمخڕە پاش عەسران ئاوێ خۆی دەخواتەوە لە بەینی بێریات و گردی حەسەن گادەری لەسەر گۆمەکەی شیرناوێ*

ئەوە سەرێ چەند سارانـە لەسەرە من دانیشتیە لە مارە بابان لۆیێ ئەمنیش دەرێم لەپاشەوی قەت کەسم ناوێ*

حەیران٤٢١

گەلە بریندارم براینە لە برینانم دەڕوا گۆلەکی خینێ*

دەنگۆ جوابەکم لۆ بدەنە حەیرانە جوانەکەی خۆم دەمەکێم  بێتەوە سەرینێ*

کودەزانم خوا بەهەقە ئەوهاش دەزانم ئەوەی دەردو بەرابی لە بەدەنێ من نامینێ*

حەیران ٤٢٢

حاویێ شەناغەی بە مێکوك وخلّتان و گلێخەیە*

ڕۆینی حەیرانێ هەردەرێی کۆترە لەنجەو لارو خۆبادانی تاوسیە وەکی لە دەوگۆمان گەردەنی هەردەکێشی هەردەمنی کارمامزەکانی دەوبەستی شەرغەیە*

ئەوەندی دەنێرمە داخوازی چبکەم نامدەنێ ناچارم دەستی بگرم بە نێژی نیوڕانێ دەریبینم لەپار داکی ئەگەر هەمووعالەمێ خوای بـمکاتن لۆمەیە*

حەیران ٤٢٣

حەیران حەیرانە حەیرانەکەی من نەرم و حەلیمە*

ئەوە سەرێ چەند سارانە ئەمن کوشتەی دوو چاوێ ڕەش و گەردەنێ زەردی بە خاریمە*

هەتا حەیرانەکەی بە درێ خۆم لەگەرە من بی هەروادەزانـم والی هەولێریمەو لەسەر تەختیمە*

حەیران ٤٢٤

حەیران ئەو دیو ئـــەو دیوی قەرەچوغی بە گەری گەری و هەرکەوە*

دەنگۆ بەچاوی منی خانەوێران زەینەدەنە بناری کەپکەشاخان چەندە جوان کارو کارمامزان لێدەکەن ڕەوە*

وەکی دەچمەوە سەر قەرەچوغی زەینێ خۆم دەدەمەوە قەراج و کەندیناوەی برینی کەون و نووم هەموو لێ دەکولێنەوە*

حەیران٤٢٥

کیژ دەیگۆ کورە حەیران هەی لە خۆمان ڕەنج بە خەسارێ*

ئەمن و توو ئەوسارەکە بەتەمای یەکدی بووین ئەتوو ببیە زاوا و ئەمنیش نووبوکی سارێ*

داخەکەی گرانم ئەتوو وا دەچیە ئیجباری و عەسکەری ئەمنیش هەر دەبی فرمیسکان بڕێژم بە سەر ڕومەتەکانی سۆری گورگوری لە مارێ*

حەیران٤٢٦

شارەکەی هەولێرێ قەدیم و زەمان جێی عەگیدو شۆڕەسوارانە*

لەوەتەی بەبیــرم دێ سەردەرەی برندە چونکە ساحێب قۆناغ و دیوانە*

شاری قەرات و منارەی سەربرندە لۆێ هەقی خۆیتی ئەورۆ جێو پەناگەی هەموو لێقەوماوانـە*

حەیران ٤٢٧

ئەورۆکە بەوێ سبیانێ چەندی دەنگان هەردەینم دەنگم دەرنایێ*

ئەرێ کاکینە خۆمن پیر نەبووم بەخودای پیریان دەکردم خەم وخەفەتێ ئەوێ دنیایێ*

هەرچەندی سەر دەینم و دەبەم بێفایدەیە بوویمەوە کۆتەرەکانی دارەبەنێ هەرچەندی دەسوتێـم بۆنسۆم لێنایێ*

★ دارەبەن واتە دار قەزوان ئەو دارە ئەگەر بشسوتێ دووکەڵی کەمە .

حەیران ٤٢٨

لە بانیێ بیستانەی زەینێ خۆم دەداوە گردی هێلانەکەوێ*

ئەوە کۆمەرەکێ قازو قورینگان دەڕۆن لۆ دەراوێ شاقازی و ئازیانەی چەندە جوان لەتاقی عاسمانێ دەکەنەوە ڕەوێ*

خۆ ئەمن شەرتمکـردیە لەگەر حەیرانە جوالەکەی خۆم هەتا ئەو کیژبی لە مارەبابان ئەمنیش قەت کەسـم نەوێ*

حەیران ٤٢٩

حەیران حەیرانـە حەیران خاوەرە*

چاوی ڕەشکۆکەو جوانن گەردەنی زەردە ئەدی نارێم بۆنی هەردەڕێی ڕەشەڕەیحانەی تەڕە*

کیژ دەیگۆ سبەینێ شایی و گۆوەندو سەیرانە ئەوجا بەشایێ دۆستان بە کۆرایی دوژمنان دیمە دەستت تێروپڕ بەدرێخۆت هەرپەڕە *

حەیران ٤٣٠

حەیران لە بانیێ قادراوەو جێژنیکانێ*

ئەوە حەیران مارێ خۆی لەگەر ە من کرد گەلە بەغەریبی پارێ خۆی دایتەوە گۆڕو گۆڕخاێ*

ئەمنیش بەتاقی تەنێ مایمەوە بەهەناسە ساردی و درەکی بەخەم لۆ کەسەرو دەردو ئاخ هەر کێشانێ*

حەیران٤٣١

دەمەڕۆ مەڕۆ بابتگەمێ هۆ هۆ مازیکەرێ چارۆك لەپشتێ*

بەژنت دەچوێنم بە توولە مێوێ گەردەنت بە زەردە لیمۆێ چاوت بە کارو کارغەزالەکانی ئاقارو دەشتێ*

دەمگۆ بەس ئەو پیرە بابەت در نەرمبی و ئەتووم بداتێ خوا دەزانی بەبێ حەج و عەمرە دەچتە بەهەشتێ*

حەیران ٤٣٢

حەیران لە گردو گردان لە گردخەبـەری*

ئەوە حەیرانەکەی منە دیتەوە لە گۆمێ شیرناوێ کراسەکەی جورجێتی تەوریزیە
چەندە قیت و جوانە فۆتە ئەنگۆرەکەی لەسەری *

نازانم نە لە تاڵحێ منە نە لەبەختێ کچەتیم حەیرانێیە هـەرچی دەرارو موشتەری
هەیـە لە حەیرانەکەی من بووینەوە کڕیارو موشتەری*

حەیران٤٣٣

حەیران وەنیە و وەنابی *

بەخوای هەتا ڕوحێ شیرین لە بەدەنمدا مابی *

غەمێ داکی هونەر و ئومێد و وریای لە دریمنی خانەویڕان بە چ دەم و زەمانان
پەرتنابی*

★ ئەو حەیرانە دیاریەکە لۆ هاوسەری خوالێخۆشبووم کە ٣٩ ساڵ هاوخەمم بوو.

حەیران ٤٣٤

حەیران لە ئۆمەرەسۆرو دارەتووی*

گەلە لەمێژە دۆست و گراویێ منی هەرجارەکی دەهاتیە جێڕاوگەوژوانی هەردتگۆت
خونچەگوری تازە پشکووتووی*

دەوەرە گلەیێن لۆبکە بزانم لۆ ئەوە بەینەکە خۆت لەمن دوورەپەرێز دەگری دەرێی بە
قسەی بەدکار و ناحەزان لەگەرەمن بێوەفا دەرچووی*

حەیران٤٣٥

دەمگۆ ئۆمـەرسۆر ئۆمەرە سۆرە*

ئەوە حەیرانەکەی من دێ لۆناو گە ڕێ شایێ کراسی لەبەری مەلەس کتانە کەوێی لەبەری داخ داخی مۆرە*

ئەمن دەزانم داکت گەلە حەسرزادەیە توخوا گەردەن بەخارو خەناوکە ئەتووش قەت مەیلان لەگەرە من مەگۆڕە*

حەیران٤٣٦

ئەمن سوارم سواری جوانەماینەکی شێمـە*

لەگەر گەزەنگی ڕۆژێ تاژیان دەکەم لە رستێ سواردەبم لە خانەی زینی عامودێ لە دەشت و دەرو دۆرو نەوران لە ڕاووشکارێمـە*

ئەرێ کاکینە ئەنگۆ نازانن پاشی عیشایێ لەپەنا تانتانەی ڕەزی لەگەرحەیرانێ لە جێڕاوگەو ژوانێمـە*

حە یران٤٣٧

ئەوڕۆکە کێشتانێ دەمگۆتە قەراتەکەی هەولێرێ توخوا سەرێخۆتم لۆ بکەی نەوی*

بەشکم قەیسەری و دوکان و باغی شارو ناو تەزبێح فرۆشان بەتەواوی لە بابی ئومێدی بەدیاردەکەوی*

ئەوە خوایە حەراریە زەردو جوانەکەو لفکێ جە مە دانی بابەجوانەکەی خۆم ببینم بەشکم ئەوجارەش تێر درمدادەکەوی*

حەیران٤٣٨

بانەبۆران  لە بەینی ئازیانە و گردەسۆری بانەکی گەلە ناودارە*

دراویێ بەینی هەردوو گردەسۆران قەدیم و زەمان جێی کارمامزەکانی سۆرەی چاوکارە*

دەمگۆتە حەیرانێ ئەوشۆ شایی و گۆوەندە وەرە دەستم لە گەرمەی هەرپەڕینی با ریشێ جەمەدانی تێکبارێ لەگەر گوفکەی  هەوری و هیزارە*

حەیران٤٣٩

بەدۆر و دۆران بە دۆرێ گۆگەمان*

هەزار خۆزگەم بـە زەمانی کوڕینی خۆمکا وەکی دوو یارم هەبوون بە هەموو کات و دەمان*

یەکیان لۆ جێراوگەو ژوان و ڕاموسانێ ئەودیان لۆ شایی و گۆوەندو هەرپەڕین و ڕەوانیێ خەمان*

حەیران٤٤٠

کەندارو گاوەرە ئەوبەر ئەوبەرە*

بە بناری قەرەچوغیداکەتم لەمن بەبنە شەواشینك و کەبەرە*

غەمێ چۆلکردنی دەشتی کاکی بەکاکی قەراج وکەندیتاوە و شوان و شێخبزێنی سەرێ چەند سارانە لەدرێمن بوویتەوە ئاخ و دەرد و کەسەرە*

حەیران٤٤١

کیژ دەیگۆ کورە حەیران کەینێ دێیە پێش لۆخۆتم بینی*

ئەوە چەند سارە دۆست و گراوێ یەکین بەسە جێراوگەو ژوان و ئەوینی*

دەوەرە بەحەراری بمکە نۆبوکێ سارێ توخوا دەبا هەتا عەیامەکێ نەیەینەوە لە مانگی هەنگوینی*

حەیران٤٤٢

کیژ دەرێ دەمگۆتە شەوبایێ شەوێ*

جوابەکم لۆ بدە کورە لاووکەی زەردوتەنك پێی برێ حەیرانەکەی توو چاو بە فرمێسکە بە دایم شەو هەتا سبیانێ چاوانی ناچیتە خەوێ*

بەس توخوا ئەگەر خەوی لێکەتبوو هەریمەستێنە چونکە درێژگەی گەلە ناسکە با رانەجفری قەیدیناکا با قەزاو بەرای لەگیانی من بکەوێ*

حە یران٤٤٣

حە یران مامزە لە دەو بەستەکەکەی شەرغەی لەبەینی بانەموردو بەلەبانی*

ئەو زالم داکە ئەمنی کوشتیە بە زولف و پەرچەمێ بەخەنەو رفت و رۆین و خۆبادانی*

سەرێ چە ند سارو عەیام بوو لۆمن دەهاتیە جێراوگەو ژوانێ چخێرەکی خوایە

ئە وە چەند رۆژە لەمن نەبانی*

حەیران٤٤٤

دۆنی دانی هیواری دەگەیمە حەیرانی لە ڕێی داران*

پێمدەگۆ زالمی زاڵمداڵ ئەتوو بەبیرت نایێ دەستلەملان و جێڕاوگەو ژوانەکەی لەجاران*

دەیگۆ کورە حەیران بەسە یەقەم بەردە تازە بێفایدەیە وا بەناوسارکەتین ئەتوو بوویە بابی کوڕان ئەمنیش وا بوویمە داکی منداران*

## ((سوپاس))

## ((کاریگەری پاشخان و ئەزموونگەری لە نووسین))

هیچ لاری و گومانێك شك نابەم لەوەی هەموو بەرهەم و دەقێکی ئەدەبی لە خۆڕسکەوە نایێ یان ئەوەتا بەهرەو کردەو ئیلهامێکی خوداییە کە بەخشیتیە دروستکراوی خۆی لە بەنی ئادەم بە نێرو مێیەوە چ بینایی بن چ نابینایی، یان ئەوەتا لە خودی تاکی و خێزانی خولیایەکی هەبووە هەوڵی بۆ داوە ئارەزوو و هیواو مەبەستی لەپشتەوە بووە پاشخان و ئەزمونێکی کۆکراوەی حەزو ئاواتەکان و تاقیکردنەوەی هەڵسان و کەوتنەوەی ژیانی ڕۆژانە و خۆشەویستی و سۆزی ئەوینی دڵداری و خاك و نیشتیمان و سرووشتی جوانی فەنای ناو دونیای عیرفان و سۆفی گەری هتد... بووە، زیرەکانەتر وێناکانی سروشت و ژیانی لێکداوەتەوە بەسانایی بەسەریاندا بازی نەداوە، بەڵکو لێکدانەوەی وردو زانستی و هونەرییانەی بۆ کردووە، لەپێش چاوو لەبیرو هۆش و دڵی خۆیدا ڕەنگدانەوەی هەبووە، لەکۆی ئەوانەی سەرەوە و ژینگەی دەورو بەرو ئەزموون کۆکراوەی خوێندنەوەو گوێگرتن لەکەسانی ژیرو خاوەن بەهرەی نووسین و ژانرەکانی ئەدەب بەگشتی ڕێچکەیەکی خۆی هەڵدەبژێرێ و تا ڕادەیەکی باش لێی سەرکەوتوو دەبێت.

دەمەوێ لێرە باسێکی کورتی ئەزموونی خۆم بکەم لە نووسینی دەقی حەیرانەکانم کە لە دووتوێی ئەم کتێبەمدا هەیە لەگەڵ بە رگی یە کە می (کۆژانی حەیران) کە بە گەواهی مامۆستایانی زانکۆو نووسەران و شارەزایانی کلتورو بەرهەمی میللی و فۆلکلۆریستان و فۆلکلۆرپەروەران و حەیرانبێژانی شارەزای هەنووکە خراونەتە نێو قالبی بەردەوامی حەیران لەسەر ڕێچکەی حەیرانبێژانی ڕەسەنی پێش هەشتایەکان،کە ئەوان قوتابخانە بوونە بۆ ئێمەمانان یەکێك لەوانە باوکی زێدە خۆشەویستم بووە، هەتا ئێرە من زیاتر ناچمە سەر باسی بابەتی نووسینەکانم بۆ خوێنەریان بەجێدێلم، لەکۆتاییدا هیوا دەخوازم هونەری نووسین و دانان و گۆتنی حەیران برەوی زیاتری پێبدرێت، چونکە تاکە هونەرێك تایبەتبێ بەگەلی کورد تەنهاو تەنها هونەری (لاوك و حەیران )ە کە زادەی ناو کۆمەڵگەی کوردەواریبن، مێژووی ڕابردوو و خەرمانی ڕەسەنی فۆلکلۆر گەواهیدەری ئەو ڕاستیەن.

پێزانینم:

★ بەڕێز غەفوور مەخمووری بۆ تێبینییەکانی و نووسینی پێشەکیەکە*
★ فۆلکلۆریستان (پیرداود مەخمووری) و (داود شڕۆل)(سعدوڵا شێخانی)
★ د:مەولود ئیبراهیم حەسەن و د: شوکریە موستەفا ڕەسول ،د:مهدی محەمەد.
★ هەرسێ براگەورە کاك حاجی عوسمان ئۆمەربلی و محەمەد قەراجی و محەمەد فتاح باوەقەیی و مامۆستا ئەحمەد چاوشین .
★ هەندرێن ئەحمەد جێگری سەرۆکی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان.
★ هەموو حەیرانبێژان و هەوادارانی حەیران بەگشتی بەتایبەتی ئەوانەی حەیرانی منیان گۆتیە و تۆماریان کردیە بە کاسێت وتۆماری ڤیدیویی و تەلەفزیونی لەوانە ( شێخ نەجات شێراوە ، دەرفەت دونیایی ، فەرحان هەمزەکۆری ، ئەنوەر پیرداودی ، ئەحمەد سێبیرانی ، هێمن سارمەمی ئەوەیان سێ کاسێتی لە حەیران و بەستەی منی تۆمارکردیە سالی (٢٠١٤)(٢٠١٥) (٢٠١٩ )، خدر مەنتك ، ڕێبوار شێخ شەروانی ، سەمیر مامەسێنی ، ئاشتی عەزیز عەوێتەیی ، جابر کەنداری ، عیماد لاوە ،تەحسین کۆلە، سیروان گردعازەبانی ،حەیرانبێژی لاو محەمەد ئۆمەربلی چاویان ماچ دەکەم .
★ هاشمی برام کە هەردەم هاوکارو پاڵپشتمە.
★ رزگاری خوارزام و خێزان و منداڵەکانم بەگشتی بەتایبەتی ئومێد.

خۆشبەختی بۆ هەموو نووسەرێك بەهیوای بەردەوامی.

**چەند وتەیەکی بەنرخی نوسەر و ئەدیب و شاعیرو فۆلکلۆرپەروەران و حەیرانبێژان:**

**لە سەر بەرگی یەکەمی کۆڕانی حەیران:**

**دە قی ئەو نامە بەنرخ و مانابەخشەی مامۆستا مومتاز حەیدەری وەکو خۆی .**

**بەڕێزان:**

**دەستەی بەڕێوەبردنی سەنتەری ئالا سلاوی وشە و قەلەم دەخوازم هەمیشە سەرکەوتووبن.........**

**زێدە خۆشحال دەبووم کە لە حەرەمی ناساندنی ((کتێبی کۆڕانی حەیران)) ئامادە بوومایە بەلام بەداخەوە لەبەر باری تەندروستیم ئەم شەرەفەم پێ نەبرا و داوا لە گەورەیی کۆڕەکە دەکەم بم بەخشن..ئەوەی ڕاستی بی ناساندنی کتیب لەهەر بواریکی ژیان بیت خۆی لە خۆیدا دەستکەوتیکی کلتووری هەمەرەنگە بەتایبەتی لە بارەی فۆلکلۆری کوردیەوە بیت لەوانەش زیاتر حەیران ،چونکە بنەماو سەرچاوەی ئەدەبی هەر نەتەوەیەك لە خودی فۆلکلۆرەوە دروست دەبی..هاوکات سەبارەت بە ژانرای حەیرانەوە لەوەش زیاتر حەیرانی کوردی ـ بەتایبەتی حەیرانی دەشتی کاکی بەکاکی هەولیر، کە نموونەیەکی هەرە جوان و هەست بزوێنی گیانی ڕۆمانسیەت و دلداری مرۆڤ پەروەریە.**

جا لەو ڕوانگەیەوە کتێبەکەی مامۆستا عومەری حاجی عەلی لە ژێر سەردێری کۆژانی حەیران ـ ئەو زادەی قوتابخانەی بە دەیان حەیرانبێژی گەورەی کوردانە، لەوەش زیاتر چونکە مامۆستا عومەر پەروەردەی باوەشی خودی باوکی و ئەوانی دیکەیە،کە ناوەڕۆکی کتێبەکەی نیشانەیەکی ڕەسەنی ڕوحی حەیرانی دەشتی هەولێرە، بگرە، زیندووکەرەوە و پاراستنی مێژووی حەیران و گەوهەرەکەیەتی،کەواتە، ئەم بەرهەمە ناوازەیە، بەشێکی زیندووی ئەدەبیاتی میللی مانەبەتایبەتی حەیران.لێرەوە ، بەگەرمی لە عاشقانی فۆلکلۆر بە گشتی و حەیران بەتایبەتی،دەکەم.

هەر لێرەوەش ، دەست خۆشی و سەرکەوتن لە مامۆستا عومەری حاجی عەلی دەکەم، ئومێد دەکەم لە کارە پیرۆزەکەی بەردەوام بێت ،هەم دیسان دەبێژم،سەنتەری ئالا مایەی سوپاس و پێزانینن ،کە بەشێکی ژیان و چالاکی کلتوریمان دەولەمەند دەکەن ،دەخوازم هەمیشە بەردەوام و سەرکەوتووبن .

سوپاس ئیمزا

مومتاز حەیدەری هەولێر ـ کوردستان ٢٠٢١/٩/٢٥

★ وتەی برای گـــەورەم دکتۆرو نووسەر(نەوزاد باجگر) کە لە کتێبی (لەناو زانکۆی جیهان بمنێژن) نوسیتی بەناونیشانی (وشە دەچێنم) دیمانەی چیرۆك و ڕۆماننووس کاك شێرزاد هەینییە، لە لاپەڕە ٣٧٩ی کتێبەکەدا هاتووە:

نووسینی شعر هەستە، ئەوی هەستی هەبێت دەنووسێت ، زۆر دەڵێم من نە شاعیرم نە هونەرمەندم بەلاَم لەو دوو ئەزموونە خۆم دەوڵەمەند دەکەم،جوان دیتن و جوان ڕەفتارکردن ئاسانترە لە ڕق و ناشیرنی،ئازاری کەس مەدە، لە ولاَتی ئێمە خەڵك بیر لە یەك جۆرە خۆشەویستی دەکاتەوە ئەویش خۆشەویستی نێوان ژن و پیاو و بەس ، بەلاَم خۆشەویستی ولاَت و خزم و کەس و خەڵکیش هەیە .

منیش وەکو خۆم هاوڕام لەگەڵ دکتۆر (نەوزاد) من نەشاعیرم و نەهونەرمەند، بەلاَم حەزم لە کاری باشە، خودا هەست و سۆزێکی باشی پیبەخشیوم دڵیشم تەڕە، بە ئومێدەوە دەڕوانمە ژیان، ئەوەندە بەگرانیم نەگرتیە زەوقیشم باشە، هەستیشم بۆ ویتاکانی نووسین هەیە، هیوادارم بە نووسینەکانم توانیبێتم چیلکەدارێك بخەمە سەر خەرمانی دەوڵەمەندی فۆلکلۆرو کلتورو کەلەلەپورو سامانی نەتەوایەتیمان .

★ بۆچوونی  شاعیری هەست ناسك  (موحسین ئاوارە):
نووسین و دانان لە ڕۆمانتیك یان ڕۆمانسیەت بەدەرنەبێ باشە چونكە لەناو
هەمووەدەقێكدا وەكو نانی نەرم و تەڕو ناسك وایە خوێنەرو گوێگرەكەی
چێژی زیاترو جوانتری لێ دەبینن بەتایبەتی لە حەیراندا بەڵام
پێچەوانەكەی واتە نانی (ڕەق) و هیشك  دەم و زمان و ددان ئازاری پێ
دەچێژن و زیاتر پێوەی ماندوودەبن.

*دەقی وتەكەی نوسەر و شاعیر مامۆستا (مەدحەت بێخەو) بە تەلەفۆن وەكو
خۆی :تەماشابكە چەندەها نامەی ماجستێر و دكتۆراً وەردەگیرێ لەسەر دەقی
حەیران و لاوك و هۆنراوەی فۆلكلۆری و زاراوەی زمانی دەشتی هەولێر ،
لەوانەیە فەلاحەكی دەشتێ یان كابراً خوێندەواریشی نەبی یان كەمەكی هەبی
دەبینی شەهادەشی نیە بەڵام چونكە نووسینی شعر بەهرەكی خودایيە، لۆیێ
هەموو كەسەك توانای نووسینی نیە"دەستت خۆشبی حەزدەكەم بەردەوامبی
زیاتر بنووسی سوپاسی هەستی بەرزت دەكەم عەمردرێژبی.

★ دەقی نامە دەنگییەکەی نوسەرو لێکۆڵەرەوەی بواری ئەفسانەوچیرۆك و حەیران و گۆرانی کوردی و زمانەماوانی دکتۆر (مەولود ئیبراهیم حەسەن):
زۆر کەس لە وەخت و ناوەخت گۆرانی دەڵێ نابتە گۆرانی گۆتن ، کە شتەکە پێدەگا لەناو دڵ و دەرونت وەکو کاکڵە هەنگوینی ساف و بێگەرد دەتکێ، ئەوەی کە سۆزی تەواوی هەڵدەستی ئەوجا ئەو سۆزە خەم بێ یان عەشق و ئەڤین بێ یا خۆشەویستی خاك و گەل و نیشتمان و سروشت بێ یان هەر شتێکی تر، چونکە هەموو شت و ژانری باش پێویستی بە کەرەستەی باش هەیە ئەوە چ جای ئەوەی کەرەستەکەش وشەو هزری پاك بێ ، هونەریش ئەو ئاستە بەرزەی دەربڕینە لە کوردەواریدا، بەتایبەت هونەری حەیرانیش ئەوەندە سەرکەوتووە ئەوەندە هونەرێکی ناسك و خۆش و ناخ هەژێنە دڵی مرۆڤەکان ئاسوودە دەکات ، دەستخۆشی لە جەنابت دەکەم کە درێژە بە ڕوحی حەیران دەدەی ئەوەی کەمن لە کتێبی کۆرانی حەیران بینیومە شایستەی ئەوەن لەمەو دواش کاتی خۆتی بۆ تەرخان بکەی و درێژە بە بەردەووامی ڕوحی حەیرانی ڕەسەنی کوردەواری بدەی، هیوادارم سەرکەوتووبی.

★ دەقی دیمانەکەی برای بەڕێزم (عەبدولڕەحمان بێلاف) لە کاتی ناساندنی کتێبی کۆژانی حەیراندا.

((دەست خۆشی لە مامی بەڕێزم مام حاجی عەلی شەناغەیی دەکەم کە توانیتی دەستی مامۆستا عومەر بگری وەکو مامۆستا عومەر گۆتی کاتی دەستی لە ناو زێڕیش بوویی وەکو کاسبی ئەو واتە مام حاجی عەلی دەستی گرتووە لە گەڵ خۆیدا بردوویەتیە ناو کۆڕو مەجریس و دیوەخانەکان و حوجرەو تەکیەکان تاکو فێری ئاداب و هونەری ڕەسەنی کوردەواری بێت بەتایبەتی بابەتی هونەری خۆشویستنی حەیران کە هونەرێکی ناوازەی کوردە و، من کە ئامادە بووم لە ڕۆژی ٢٠٢١/١٠/٦ لە سەنتەری ئالای خۆشەویست بۆ ناساندنی کتێبی کۆژانی حەیران کاك عومەر پێشەکییەکی خوێندەوە بەڕاستی من گوتم ئەوە حەقی بڕوانامەی فەخری هەیە ئەوەندە بە تێرو تەسەلی باسی لە کۆژانەکانی ژانری ئەدەبی حەیران کردبوو دووبارە دەستخۆشی لە مامۆستا عومەر دەکەم و هیوادارم بەردەوامی بە بواری نووسینە میللیەکانی بدات بەتایبەتی بەستەی کوردی و بەتایبەت تریش هونەری ڕەسەنی حەیران.

★ دەقی نامەکەی برای خۆشەویست و قەدرگران(عەبدولڕەحمان فەرهادی) سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی کورد:

دەستخۆشی لە بەڕێز کاك عومەر حاجی عەلی دەکەم لەم ماوەیەدا کتێبی کۆژانی حەیرانی ناساندو دانەیەکی کردە دیاری من خەریکی زیندووکردنەوەی دەقە فۆلکلۆرییەکان و دانان و نووسینی هونەرێکی ڕەسەنی ناو ژانری ئەدەبی میللیمانە ئەویش گەنجینەی حەیرانی کوردیە لە دەشتی هەولێر، کە تاکو ئێستاش بایەخی تەواوی پێنەدراوە ، ئەم تۆمارکردن و بڵاوکراوانە گرنگییەکی یەکجار زۆری هەیە ، بۆیە هیوادارین لێکۆڵەرەوان و پسپۆڕانی بواری ڕەسەنایەتی لەسەر بنەمای ئەو دەق و گەنجینە پڕ بەهایانە بابەتەکانیان دەوڵەمەند بکەن و بیکەنە بنەمای زانستی و هونەری ، هیوای بەرهەمی زیاتر لە کاك عومەر داواکارین.

★ دەقی نامەکەی کاکە (هندرین ئەحمەد عەبدوڵڵا) جێگری سەرۆکی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان دوای ئامادەبوونی لە کۆڕەکەی س (ئاڵا)ی خۆشەویست:

لە ئێوارە کۆڕێکدا مامۆستا عومەری حاجی عەلی شەناغەیی پەرتووکی کۆژانی حەیرانەکانی خۆی شیکردەوە، ئامادەبوونی من دوو ڕەهەندی هەبوو یەکەمیان کاک عومەر بۆ من وەکو برا گەورەمە و دووەمیان بەدڵ خۆشحاڵ بووم کە ڕێچکەو توانای دانان و نووسین و گۆتنی حەیران بە ڕەسەنایەتی خۆی لە سەر ڕێچکەی خارە حاجی عەلی شەناغەیی درێژەپێدەرێکی ڕەسەن و زمان پاراوو شارەزای وەکو کاک عومەری هەیە، ئەوەش بە شایەدی شارەزایانی ئەکادیمی وەکو برای گەورەم مامۆستا مومتاز حەیدەری و خوشکە دکتۆرە شوکریە موستەفا و کاک د. مەولود ئیبراهیم حەسەن و کاک د. مەهدی محەمەد و کاک عبدولڕەحمان بێلاف و حەیرانبێژان بە گشتی بۆیە منیش وەکو (د. مەولود ) گۆتەنی دەڵێم بەڵێ حەیران بەردەوامە.

★ مامۆستا هەست ناسك (شیرزاد هەینی) فەرمووی (حەیران جوان).

★ دەقی نامە کەی نوسەر و فۆلکلۆریست مامۆستا(داود شرۆل) :

تام و چێژی حەیران لە توانەوەی هەستێکی بزرو حەشاردراوی شادەمارەکانی موچرك هێنە بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش لەگەڵ کۆمەڵێك یادەوەری خۆش و ناخۆش لە چوونە ژوانی کچەتیم حەیرانەکەی شوانکارۆکە و ڕەوەندۆکان لەپەنا سەوەشیرو چیغ و ئەستوندی کۆلینێ تێکەڵ بە هەستێکی پڕ لە ژیلەمۆ و سوتێنەری لە تەقەلۆ هاتنەدەری جەستەی عاشقێکی وێڵ و سەرگەردانی خەیاڵی گۆمێ بازنان وعەبداڵ و بناری قەرەچوغی خۆمان و کەندی کەندێناوەی ڕەنگینی بەهەشت ئاسا و هەستێکی گەرمی شێتانەی بوارە ڕاوی بناری قەرەبێتك و قەرەبۆتك و شەیتان قەراو بیرێ مەحمودی سەنان و بیری حاجی ڕەحمان گەرازی عاڵلا و گەڕانەوە بە دوای هۆبە و هەوار و بنگەی مارێ بابی کچەتیم حەیرانێ و سەوداسەری و دابڕانە لە بۆنی بسکان و گەردەن و خاری ڕوومەتان بەڕاستی کتێبی کۆژانی حەیران کە کاك هاشمی برات گەیاندیە دەستم، بەڕاستی دروستی ئەوە حەقی خۆیتی دکتۆرای فەخری لەسەر وەرگری ئاخر ئەو فکرە جوانە ئەو دامەزراندنە ئەو هەموو وشە کلتوری و ڕەسەنانە ئەو دأنان و نووسینە جوانانە کە هەمووی لە دارشتن و بەهرەی خۆتە لەسەر دڵ و دڵداری و سۆز و عەشق و دابڕان و خۆزگە و ئاوات و ژان و ژووری وراتەکەی خۆمانە لەسەر دەشت و ئاقارەکەی خۆمانە لەسەر زولم و زۆرداری وڵاتەکەی خۆمانە کە لێمان دەکرێ، ئەو هەموو شتە جوانەت کردیتە تاریخ و جوغرافیاو ڕۆشبیری و کۆمەڵایەتی و ئاین و هەموو بابەتەکانی ژیانت تێدا بەرجەستە کردیە دەستخۆشیت لێدەکەم بەڕاستی فکرت باش بۆی چووە ئەوە بۆ میلەتەکەمان جێگای ڕێزە.

★ دەقی نامەکەی رای خۆشەویست کاکە (سەرهەنگ مەلا موحەمەد بندیان)

حەیران نە نووسینی ئەوەندە ئاسانە نە گۆتنیشی حەیران نووسین شارەزاییەکی زۆری دەویت هەر لە ناسینی کلتوورو کەلەپوور و جوگرافیای سنووری حەیران و وشەی سادەی بەکارهاتووی گوندەکان حەیران وشەی رێزمانی قبوڵ نیەحەزی لەو وشەو واتایانەیە کە داپیرە و باپیرە لە دەشت بەکاریان دەهێنا،کەرەستەکانی حەیران زۆربەی باسی نازدارحەیران و شیشە و کاروباری رۆژانەی گوند وەکو لە دەراو و بیرێ لەکۆر و کانی و مەرۆ هەرگرتنەوەو مەڕ دۆشین و لە بەر و بێرێ و لە سەر دارێ تەونی و دار و پوشکان و دوایێ مێگەلان و...هتد

مامۆستا عومەر حاجی عەلی شەناغەیی کەسایەتییەکە شارەزاییەکی باشی هەیە لە دانان و بەکارهێنانی وشەکانی ناو دەقی حەیران بە شێوەیەکی جوان و مانابەخش گوێگری حەیران تامەزرۆی پێ دەشکێ،مامۆستا لەو بوارە سەرکەوتوو بووە داوای سەرکەوتنی زیاتری بۆ دەخوازم بۆیە هیوادارم بەردەوام بێت، چونکە هونەری حەیران ئەورۆ زۆر پێویستی بە نووسەری ئاوا شارەزا هەیە هیوادارم کەمتر و وردتر بنووسن هەتا دەقی حەیران هەواداراني مەستبکات نەك وشە ڕیزکردن و لاسایی بێت دووبارە دەستخۆشی لە مامۆستا عومەر حاجی عەلی شەناغە دەکەم.

★ دەقی دیمانەکان لەلایەن برای بەڕێزم خارە(هوشیار نوری لەك) بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنی ڕەسەن وبرای خۆشەویستم خارە (حاجی کازم بندیان) و کامیرەوانی تەلەفزیۆنی ئازادی کاکە (کاروان) بە سوپاسەوە ئامادەی کۆڕەکە بوون سوپاسی بێپایانم بۆ دەستەی کارگێری سەنتەری ئالاو کاکە د. ڕامیار وەکو بەڕێوەبەری سەنتەری ئالا.

★ دەقی دیمانەکەی برای ئازیزم (( موحەمەد قەراجی))دانەری حەیران و بەستەی میللی.

لەسەر ئەوەی کاك عومەر نووسیتی لە کۆژانی حەیران وەکو خۆم دەستخۆشی لێدەکەم لەسەر کاغەزی سپی لۆ کاك عومەر تەوقیع دەکەم ئەمن حەیرانەکانی کاك عومەرم گوێ بووە دڵنیامە کتێبێکی سوودبەخش دەبی دووبارە دەستخۆشی لێدەکەم ٢٠٢١/١٠/٦

★ دەقی دیمانەی کاکی خۆشەویستم کاکە (هێمن سارمەمی) حەیرانبێژی دەنگخۆش لاوو شارەزای بواری مەقام و گۆرانی و بەستەی میللی

بەڕاستی ئەوڕۆ لە کۆڕی ناساندنی کتێبی کۆژانی حەیرانی برای بەڕێزم مامۆستام و برای بەڕێزو خۆشەویستم مامۆستا عومەر مام حاجی عەلی دەتوانم بڵێم ئەوە نۆبەرەی کتێبەکانیتی کە ئەوڕۆ دەیناسێنی پێکهاتووە لە کۆمەڵێك حەیران دەتوانم بڵێم هەم لە حەیرانی کۆن و ڕەسەن دەچن هەم حەیرانی نوێ و سەردەمیشە،لەبەر ئەوەی مامۆستا لە هەندێك حەیراندا وشە و زاراوەی وەهای بەکارهێناوە کە وشەکان کلتورین و لە حەیرانی پێشینەکان نیە وشەکان وشەی زاری چینی باب و باپیرانن و ڕەسەنن، وەکو خۆم زۆر کاری هونەریم لەگەڵ کردیە زۆربەی حەیرانەکانی مامۆستا عومەرم گۆتیتەوە بەشانازیەوە بە مامۆستای خۆشمی دەزانم، چونکە زۆر پشتگیرو هاندەرم بووەو چەندین حەیران و بەستەی مامۆستا عومەرم گۆتیەو لەچەندین کاسێت تۆماری دەنگی و ڕەنگیمان کردووە.

جیا لە حەیراننووسەکانی تر مامۆستا توانی لە شەڕی نگریسی داعش لەساڵی

( ٢٠١٤) حەیران لەسەر پێشمەرگە دابنێ و بنووسی کە دەتوانم بڵێم یەکەم کەس بووە زۆر شارەزایانەو بە جوانی دەقی حەیرانی لەسەر پێشمەرگە نووسیوە بە شانازیەوە لە کوردستان تیڤی کردمە کلیپ و پەخشکرا و سەدایەکی باشی هەبوو ، دووبارە دەستخۆشی لە مامۆستا عومەر دەکەم و هیوای تەمەن درێژی بۆ دەخوازم.

★ دەقی وتەکەی براوهاوریم کاك (ئەحمەد چاوشین) دانەری حەیران و بەستەی میللی:

بەڵێ بێگومان ئێستا سەردەمی ئەوەیە بکرێتە کتێب لەسەر کاسێت تۆماربکرێن لە تەلەفزیۆنەکان پیشان بدرێن و کلیپیان بۆ بکرێ ، کاك عومەریش وێڕای دەستخۆشیم هەوڵێکی زۆر زۆری دایە لە کتێبەکەی کە بەناوی کۆژانی حەیران چونکە دانانی حەیرانی ڕەسەن خۆی لە خۆیدا بەڕاستی شارەزایی و هەوڵێکی زۆری دەوێ وا دیارە کاك عومەریش کۆی ژانەکانی خۆی و میللەتەکەی خزاندۆتە ناو دەقی حەیران و هەست و سۆزی خۆی دەربڕیوە لۆ نازدار حەیرانێ و دەردی دووری و دابڕان و هەست و سۆزی ئەڤین و عەشق بۆیە زۆر دەستی ماندووبونی دەکوشم ناویشم لێنایە (ڕەشەڕەیحانە) چونکە دایم ڕەشەڕەیحانی لەسەر بەرکیە و دەستخۆشی لێدەکەم هیوادارم کۆڵ نەداو بەردەوامبی دەستی تووش خۆش کاك حاجی کازم سوپاستان دەکەم.

★ دەقی نامەکەی برای گەورەو ئازیزم حەیرانبێژ (شێخ نەجات شێراوەیی):

من وەکو حەیرانبێژێك ئەوڕۆ لە کوردستان پڕ بەدڵ دەستخۆشی و پیرۆزبایی لە برای بەڕێزم مامۆستا عومەر مام حاجی عەلی دەکەم، دەتوانم بڵێم مامۆستا هونەری ڕەسەنی کوردی دەوڵەمەندتر کرد بە پەرتووکە جوانەکانی بەتایبەت لە نووسین و دانانی حەیران و لاوك و بەستەکانی ، ئەگەر چەند کەسانی تر هەبێ وەکو مامۆستا عومەر لەو بوارە بەو جۆرە بێنە مەیدان و قۆڵ و بازووی مەردانەی لێهەڵکەن دڵنیام کەلتور و کەلەپوورو ڕەسەنایەتی نەتەوەکەمان دەوڵەمەندتر دەبێ، چونکە نووسینەکانی مامۆستا شایەنی ئەوەن بە دەنگی خۆش و ئەدای جوان بکرێتە سەرچاوەو بەرهەمی بەپێزو تۆمار بکرێن بەتایبەتی حەیرانەکانی، من بەخۆشحاڵییەوە حەیران و بەستەی مامۆستا عومەرم گۆتیە و شانازیشی پێوەدەکەم، دووبارە دەستخۆشی لە مامۆستا دەکەم و هیوای بەردەوامی و تەندروستی باشی بۆ دەخوازم .

دوا وته:

نایشارمەوە لێتان بەڕاشکاوانە دەڕیم براینە خوشکینە لێرەو لەوێ چەند کەسێك کە دەتوانم بڕێم لەپەنجەی دەست تێپەڕ ناکەن ویستیان یان دەیانەویست ساردم بکەنەوە لەسەر نووسینی دەقی حەیران و بەستەی میللی هەندێکییان بە بۆچوونی خۆیان لایان وایە کاریگەری لەسەر باری کەسایەتی من دەکات چونکە ڕووبەڕو پێیان گوتیمە .

بەداخەوە هەتا ئێستاش پێوە کاریگەری کەلتوری داب و نەریتی بێگانە چەسپاومان لەسەرماوە ،لە ڕوانگەی ئەوەوە دەتوانم بلێم هێشتا لە گرنگی هونەرو گۆرانی و مۆسیقا و دەنگی ڕەسەن و دەقی ڕەسەنی فۆلکلۆری و میللی تێنەگەیشتووین ،کە بەپێچەوانەوە هەموو گەلانی ئەوروپی و ئەمریکی و ڕوسی و تەنانەت عارەب و تورك و فارسیش شانازی بە نووسەر و ئەدیب و شاعیر و داب و نەریتی خۆیان و بەرهەمە فۆلکلۆری و میللی و هونەرییەکانیان دەکەن و پەیکەر و مەدالیای زێڕین و کۆڕو سیمیناری گەورەو ڤیستیڤالی سالانەو نەتەوەیی سازدەکەن و دیاری دەبەخشن بە خاوەنەکانیان....هتد.

بەڵام خۆشبەختانە یەکەمیان وەکو خۆم فرچکم بە بەرهەمی فولکلۆری و میللی و کلتوری گەلەکەم گرتووە لەسەر دەستی یەکەم قوتابخانەم کە بابی ئازیزو ڕێپێشاندەرو دەستگری یەکەمم بوو، ئەوەیان بۆمن وەکو خەزێنەکی بێ کۆتا وایە و زۆر قازانجم لێکردوەو شانازی پێوەدەکەم .

دووەمیان ئەو دەستخۆشی و ماندووبوونانەی ئەو نوخبە ڕۆشنبیرو کەسایەتی و مامۆستایانی زانکۆو شارەزایانی بواری ئەدەب و نووسین و هەستی نەتەوایەتی و خەمخۆرانی سامانی نەتەوایەتیمان و ئەو هەموو وتە جوانانەی بە نووسین و نامە و دەستخۆشیان گروتینی وزەبەخشی من بوون لە ڕاستیدا بۆیە بەردەوام دەبم ئەگەر خوا تەمەن بدات.

بۆیه من لێرەوه ئامۆژگاری نەوەی داهاتوومان دەکەم و دەرێم:

هیچ گەل و نەتەوەیەك خاوەن خاك و نیشتیمانی جێگیری خۆی نابێ ئەگەر رێز لە زمان و کلتور و هونەر و زانست ونوسەران و رۆشنبیران وکتیب وبنەما سەرەکییەکانی ژیان و ئاو و ئابووری وڵات و پاراستنی ژینگە و ئاسایشی نەتەوەیی و کتێب و خوێندن و خوێندنەوە و نووسینی دەقی ئەدەبی و زانستی و رێزو بنەما سەرەکییەکانی وشە و فەرهەنگی نەتەوەیی و زانا و بیرمەندی خۆی نەگرێت و نەیانکاتە بناغە و بنچینەی پەیڕەوی رۆژانە و بە زمانی خۆی نەئاخفێ ئەوە بزانە رۆژێك لە رۆژان دادەرمێ و هەرەسدێنێ و تەنانەت زمانەکەشی دەکەوێتە مەترسی لەناوچوون .نموونەش مامۆستا ئیسماعیل بێشکچی گەورە نووسەری تورك و خەمخۆری دۆزی کورد لە نامیلکەی کوردستاندا دەڵێ:

لە کۆنگرەی نەتەوەیی تورکدا مستەفا ئەتاتورك دەڵێ ئێمە بۆیە بەلقانمان لەدەستدا چونکە گەلانی بەلقان بەزمانی خۆیان ئاخافتن خاڵیان لەسەر پیتەکانی خۆیان دانا رێزو پێگەی بیرمەند و رۆشنبیر و نووسەرەکانیان بەرز نرخاند، هونەر و زانستی خۆیان برەو پێداو بەهەندیان هەڵگرت وەکو سامانێکی نەتەوەیی .
منیش دەرێم نەتەوە لە تاك و خێزان و کۆمەڵ پێکدێت کۆمەڵگەی وریا و هوشیاریش مایەی خۆش گوزەرانی و بەختەوەری دەبێت و ئینتیمای نیشتیمانی بۆ خاك و گەل دەبێ و پارێزگاری لە بنەما سەرەکییەکانی ژیان دەکات و دەبێتە خاوەن هزر و هێزی گەلێکی لەبن نەهاتوو زەفەر بردن پێی ئاسان نابێت.

هەموو گەلانی دونیاش کە پێشکەوتوون ئەو پرەنسیپانەیان رەچاوکردووە و فەخرو شانازیان بە کلتوری خۆیان کردووەو لە مۆزەخانەکان پاراستوویانن هەروەها پەیکەریان بۆ کەسانی خۆبەخش و فیداکارو خاوەن شاکاری جوان کردووە کە لەم بوارانەدا دڵسۆزانە تێکۆشاون و ناویان لە مێژوودا تۆمارکراوەو دەمێنێ، لە کۆتاییدا دەستتان دەکوشم خەمخۆر و پەرۆشانی هونەری گۆرانی و حەیران و لاوك و بەستە و مەقام وهۆرە و سیاچەمانە و بەرهەمی فۆلکلۆری و میللی و کلتوری رەسەنایەتی بە گشتی.

لێکدانەوەی وشەکان:

★ بێ عدور : بێ زەوق بێ رەنگ و ڕوو .
★ سەردوڵکە: واتا گۆتن بەدەنگی سۆزی غەریبی و لاواندنەوەی سەر جەنازە و ناو تازیە یان دوای کۆچ و دابڕانی یەکجاری.
★ ناسۆر: ئەو برینەی ساڕێژنەبی.
★ تیکدەچرژی: واتە لۆیەك دیتەوە یان بەرەو نەمان لۆ سێبەر دەگۆتری یان تێکئاران و قەرەبارغی زۆر و بیسەروبەری.
★ دەقرقری:بیئارامی یان دوودلی سەبر نەمان.
★ توڕندی و سرك: ئەوە بە مامز و وراغی بەرزەو گیانداری تیژڕەو کە گرتنی ئەستەم دەبی لە ترسان یان تەنگاو کردنی.
★ حەسرزادە: واتە رەسەن یان بابان و داکچاك یان بنەماڵەو دیار و باش.
★ بەرامپیل: لە پارچە قوماشێکی سپی شەعادە یان خام بە چوارگۆشەیی دروست دەکرا ئافرەت بەپشتی چیلکە دار یان قشپل یان کایان پی دەکیشاوە مندالیشیانی لە پشتی دەکرد.
★ داچۆرایە: واتا شۆربویتەوە زیاتر بۆ لۆچی دەموچاوبەکاردی.
★ متمانە:واتا بڕواپیبوون و بەوەفایی یان نهینی پاریز.
★ قۆشەن: ناوی گوندە بەلام قۆشەنی بەماناى سواران بچنە پێشبرکی.
★ دۆشدامایە: واتا کزو مەلول و بێزەوقە یان سەری سوڕمایە نازانی چبکا.
★ هەتوان: واتا دەرمانی برین و تیمارکردن.

★ پیناو: بەزۆری بە ئافرەتی تەمەن سەروی چل سالی دەگوترا تاکو نهێنی پارێزبی لە بەینی دوو یەکتر ویست یان دلدار یان خۆشەویست.

★ قاسید: قاسید زیاتر بۆ پیاو بەکاردەهات چونکە بۆ ڕێگای دوور بوو بەپیادەو بە سواری ماین و هەسپ وـــزیاتر بۆبردنی پەیامی ئاشتی و شەڕ بەکار دەهات.

★ گەردانە: ملوانکەیەکی لە زیر یان لە زیو بوو لەگەردەنی ئافرەت و بوك دەکرا.

★ نسار:بەو سیبەرە دەگوترێ کە تیشکی خۆر کەم لێی دەدا.

★ ماخۆی چارچاو:واتە پیاویك دوو ژنی هەبیت ئەوجا ئەگەر یەکەك شەوتای بگرتایە نەفەرەکیان دەنارده پێشمالی خاوەن دوو ژنەکە بانگی ڕادەدێرا دەیگوت بە شەو دەگری تا بەڕۆژ بەردەدا ماخۆی چارچاو چ دەرمان دەدا ئەویش یان دەیگوت بارکە یان فروجاو.

★ شەوتا: واتە بەشەو تای دەگری .

★ سیبەرۆ: ئە وەش هەر تایە بەلام لەرزیشی لەگەرە کاریگەرترە لە تای.

★ گەمی:واتە کەرەك یان بخیرەی بچوك کە لە چوپی سەیارە ودار دروست دەکرا لە رووباری پیی دەپەڕینەوە.

★ حەسەن گادەر: پیاوەکی ناودار بووە خاوەن زەویەکی زۆر بووە لە گوندی بیریاتی شویضنەوارەکەی ئێستاش ماوە بوویتە قەبرستان شوێنەوارە.

★ خورمەچیچان:گییەکی خۆڕسکە لە ناو وەرد و شۆ و ئاقار و زوور و جیی ئاوگر دەبی.

★ قانات: بەو دیوارە کەوانەییە دەگوترێ لەولاو ئەولای بیری ناو مالان دروست دەکرا نیزیکەی ١٥٠سم برند بوو بەکرەو دەولکو کندری لەسەر دەسورا لۆ ئاو هەرکیشانی.

★ هەردەزەلی: وەکو خلیسکانە بەڵام لەجێی هیشك وەکو پێکەتن.

★ کولك: واتە گری زیاتر لۆ سەر بەکار دی.

★ چوشتیر: بەو گیانلەبەرە دەگوترێ لە گیسکی ترازایە نەبوویتە بزنیش واتە تەگەی نەخواردیە لە مانگا پێی دەرین مێتگوین لەمەر پیی دەرین بەردیل لەمریشك پیی دەرین بارکە....هتد

★ خیلۆك: بەو دەغر ودانە دەڵین کە ساڵی رابردوو تۆ کرابی ساڵی دووەم لەگەل باران بارین شینبوویتەوە وەکو گەنم و جۆ و نۆك و نیسك ....هتد

★ بەراو: واتە ئەو بەروبوومانەی ئاو دەدرێن.

★ خلتان و گلیخە:دوو ڕوەکی خۆڕسکن .

★ گۆگەم: ڕوەکێکی خۆڕسکە لە دەو ڕوباران شیندەبی لۆ گێسك بەکاردێ زۆر تیژو تارە ڕاوەماسی پێ دەکرێ.

★ داوگەمیل: گوندێکە لە دەشتی قەراج*

★ ئۆقرە: ئارام.

★ تیشە: بەشاخی تیژ دەگوترێ.

★ ڕەوەز: بەوشاخە دەگوترێ کە وەکو کەوانەی خەت خەت و لەنزیك و سەر یێك دروست بووە.

★ مەفتەن: واتە شوێنی لە دایك بوون و ژیان و زێدی باپیران زۆر جارلەبەر ئەوەی هەندەت خۆشدەوێ لە حەیراندا پێی دەرێن کاولە مەفتەنێ واتە( وەتەن).

★ باعیز:واتە ڕێگری کۆسپ دروسن کردن و تێکدانی بەینی دوو خۆشەویست.

★ عەیامەك: واتە ماوەکی زۆر یان هەتا ساڵەکی دیارە لە وشەی ( عامی) عەرەبی وەرگیراوە.

★ بەدکار: واتە ئەوانەی کاری تیکدەری و فتنەو ئاشوب دەگێڕن.

★ ناحەز: واتە دوژمن نەیار یان حەسودی و ئیرەیی.

★ لۆمە: واتە گلەیی یان ئەگەر کەسێك باشبی دەرێن لۆمەی لێنایێ .

★ حەمایل: جۆرە خشڵێك بوو کاتی خۆی بە بەرۆکی کورتەك و سوخمەی ئافرەتان وەدەکرا لۆ جوانی زۆربەی زیو بوو.

(( زۆر ســــــوپـــــــاس ))

# KOZHANE HAERAN

Omer Haji Ali Shanaghaee

حەیران دەقێکی ئەدەبی ڕەسەنی کوردەواریە مێژووەکەی دیارنیە، لە هزر و بیری کەسانێکی نەخوێندەوار لە دەشت و دەرو ڕەشمار نشین کاروانچیان و جوتیاری و مەڕداری لە گوندەکانی کوردستان لەگەڵ فیقەی دوزەللە سەدای نایە و شمشاڵ خولقاوە، پاشخانێکی فۆلکلۆر و کلتوری باب و باپیرانە دەماو دەم وەرگیراوە پیاو و ئافرەتی دەنگ خۆش و لێزان و شارەزا و چاوکراوە گۆتویەتی، ناوەرۆکی حەیران گوزارش لە ( عەشق و سۆز و ئەڤین و ئاهو حەسرەتی دابڕان و دووری و بەیەك نەگەیشتنی دوو ئەڤیندار و جێڕاوگە و ژوان و سروشت و جوانی زێد و مێژوو هەستی نەتەوایەتی و شۆڕشگێڕی و لاواندنەوە و پیاهەڵدان و لەدەستدانی ئازیز و خۆشەویستانە، لە کوڕ و دیوان و حوجرە و تەکیەکان بە هێمنی لەسەرەخۆ و لە دەشت و دەر و سەر گرد و بەرزایی بە سەدای هەزایی چڕداراوە، حەیرانی ڕەسەن ناخهەژێن و دڵبزوێنە، بۆیە هەتا تاکە کوردێك مابێ حەیران هەر حەیرانە و بەردەوام دەبێت بە گۆڕانکارییەکی کەمەوە.

دەقی حەیران نابێ بەدەربێ لە وشە و زاراوەی کولتوری و فەرهەنگی دەشت و دەر، لەگەڵ هەموو سەردەمەکان دەگونجێ و دەڕوات و پیرنابێ، ئەگەر لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی هونەری و زانستیانە لە دەقە ڕەسەنەکانی حەیران بکرێت زۆر مانای زیاتر لەخۆ دەگرێت.

بەرگی دووەم

چاپی یەکەم